## ناسنامەی کتێب:

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب: | هاوسەرگیری سەرکەوتوو |
| ئامادەکردنی: | دکتۆر ابراهیم طاهر معروف |
| نەخشەسازی ناوەوە: | کۆمپیوتەری نارین(کامران رفیق) |
| ساڵی چاپ: | ٢٠١٥ ز |
| ژمارەی سپاردن: | (١٩) ی ساڵی (٢٠١٥) ی پێدراوە. |

# هاوسەرگیری سەرکەوتوو


ئامادەکردنی

دکتۆر ابراهیم طاهر معروف

پسپۆڕی تەندروستی کۆمەڵ

دکتۆرا لە دراساتی ئیسلامی



٢٠١٥/١٤٣٥

# پێشکەشە بە:

هەموو ئەو خوشکو برایانەی هەوڵدەدەن کەوا پرۆسەی هاوسەرگیرییەکەیان سەرکەوتوو بێت

# پێشەکی




بەناوی خوای گەورەو میهرەبان وسوپاس و ستایش بۆ خاوەنی هەردوو جیهان و سەڵات و سەلامیش لە گیانی پاکی پێغەمبەری پێشەواو درودو رەحمەتیش بۆ هاوەڵان و شوێنکەوتوان تاوەکو کۆتایی زەمان.

بیرۆکەی نوسینی ئەم پەڕاوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٢٠١٢ کەوا دەزگاکەمان (دەزگای بەیان بۆ گەشەپێدانی مرۆیی) پرۆژەیەکی پێشکەش بە بەڕێوەبەرایەتی ڕێکخراوە ناحکومیەکان کرد بەناوی (بەرەو سەرکەوتنی پرۆسەی هاوسەرگیری) بەڵام ئەو پرۆژەیە بۆمان دەرنەچوو نەمانتوانی ئەنجامی بدەین، چونکە لەو کات دەزگاکەمان تەنها مۆڵەتی بەغدای هەبوو ، بۆیە پێیان ڕاگەیاندین کەوا ناتوانن لە هەڵبژاردنی پرۆژەکانی کوردستان بەشداربن ، بەڵام پرۆژەیەکی نزیك لەو پرۆژەیە بۆ دەزگای (سۆز) دەرچوو.

لەبەر گرنگی ئەو پرۆژەیە لەساڵی ٢٠١٣ هەماهەنگی کرا لە نێوان دەزگای بەیان ودەزگای سۆز بۆ پێشکەشکردنی ئەو پرۆژەیە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ڕێکخراوە ناحکومیەکان کە نیازمان وابوو چەند خولێکی یەك لە دوای یەك بۆ ئەو کەسانە بکەینەوە کە پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجام دەدەن بە هەردوو ڕەگەزەوە و تیایدا چەند وانەیەك بوترێتەوە لەلایەن پسپۆڕان بۆ ماوەی چوار ڕۆژ، لە بوارەکانی کێشەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و تەندروستی و یاسایی، دوایی بڕوا نامەش پێشکەش بە بەشداربووان بکرێت، وە نامیلکەیەکیش چاپ بکرێت لەسەر ئەو کێشانەو چۆنیەتی چارەسەرکردنی و دابەشبکرێت بەسەر بەشداربووان. پاش ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکان بەشداربوون و ماوەی دوو ساڵ تێپەڕی بەسەر ئەو پرۆژەیە دەست دەگەین بە لێکۆڵینەوە لەسەر بەشداربووان تاوەکو بزانین ئەو جۆرە خولانە کاریگەری هەبووە لەسەر کەمکردنەوەی کێشەکان و کەمکردنەوەی ڕێژەی تەڵاق وجیابوونەوە. چونکە ئەو جۆرە خولانە کاریگەری زۆر ئیجابی هەبووە لە وڵاتانی مالیزیاو سعودیەو هەندێ وڵاتی تر لەسەر کەمکردنەوەی ڕێژەی تەڵاق.

بەڵام بەداخەوە لە ساڵی ٢٠١٤ لەبەر باری سیاسی و ئابووری ناوچەکە هاوکاری پرۆژەکان دواخران بۆ کاتێکی نادیار، هەر بۆیە بیرمان کردەوە لە جیاتی ئەوە هەوڵ بدەین پەراوێك لەسەر ئەو کێشەو چارەسەرەکانیان چاپ بکەین و دابەشی بکەین بەسەر ئەو کەسانەی کەوا پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجام دەدەن بە خۆڕایی تاوەکو لە داهاتوودا لە ژیانی هاوسەرێتی و خێزانداریدا سوودی لێوەربگرن و بە هیوای کەمکردنەوەی ڕێژەی کێشەو ناکۆکیەکان و کەمکردنەوەی ڕێژەی تەڵاق و جیابوونەوە.

بەرنامەی داڕشتنی ئەو پەڕاوە بریتی یە لە دابەشکردنی پەڕاوەکە بۆ چەند بەشێك:

بەشی یەکەم: باسی پێناسەی خێزان و هاوسەرگیری و گرنگی خێزان وپیرۆزی و ڕێزی ئەو پرۆسەیە لە ئاینی ئیسلام و ئاینە ئاسمانیەکان.

بەشی دووەم: لەو بەشەدا لە باسی یەکەم، باسێکی دوورو درێژی کێشە کۆمەڵایەتیەکان و ئابووریەکان دەکات کە لەلایەن چەند پسپۆڕێکەوە نوسراوەو بیروبۆچوونی هەریەکیان بە جیا نوسراوە دەربارەی خێزان و کێشەکان و چارەسەریان، وە ئەو جۆرە کێشانە ڕێژەی لەهەموو جۆرەکانی تری کێشەکان زیاترە. لە باسی دووەمدا باسێکی کورتی هەندێ لە سوودەکانی ئەو کێشانە دەکات بۆ زیاتر پتەوبوونی پەیوەندی نێوان هەردوو هاوسەرو زیاتر لێك تێگەیشتنیان.

بەشی سێیەم : باسی کێشەکانی تەندروستی دەکات لەگەڵ چارەسەریان.

بەشی چوارەم: باسی یاساکانی پەیوەست بە هاوسەرگیری دەکات. ئەوانیش زۆر پێویست و گرنگە کەوا هەردوو هاوسەر زانیاریان دەربارە ی هەبێت تاوەکو هەر بڕیارێکی دا زانیاری لە سەر هەبێت و بەڵگەدار بێت.

بەشی پێنجەم وکۆتایی: باسی یەکەم: هەندێ ئاماری شاری بەغداو شارەکانی تر (بە هاوکاری هەندێك لە دۆست و برادەران لە شاری بەغدا)، و باسکردنی چیرۆکی هەندێ لەو کەسانەی پرۆسەکەیان هەرەسی هێناوەو جیابوونەوە، بۆ ئەوەی دەرسی لێوەربگرین. لە باسی دووەمدا ، ئاماری ژمارەی ئەوانەی هاوسەرگیریان ئەنجامداوە لەشاری هەولێرو ژمارەی ئەوانەی جیابوونەتەوە و دیاریکردنی هۆکارەکانیان و ڕێژەی هەر یەکێك لەو هۆکارانە.

لەم پەڕاوەدا نەمانویست بچینە ناو چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەم پرۆسەیە بە درێژی، چونکە لە هەموو سەردەمەکان لەهەر نەتەوەیەك و ئاینێك لە کۆن و نوێدا وە ئەم پرۆسەیە گرنگی

پێدراوەو بنەمای ئاینی وکۆمەڵایەتی و کەلتوری هەبووە لە بابلیەکانەوە(بەتایبەتی لە سەردەمی حامورابی و ٢٨٢ یاساکەی)، بگرە بۆ میدیەکان و لەناو ئاینی زەردەشت و بوزیەکان و هندۆسەکان و گریك و ڕۆمەکانی بتپەرست و ئاینی یەهودی و مەسیحیەکان و تاوەکو دەگاتە کەمە نەتەوەکان و ئاینە دەستکردەکان.

لە کۆتاییدا بەهیوای ئەوەی کەوا ئەم پەڕاوە سوودمەند بێت بۆ هەموو خوشك و برا گەنجەکانمان کەوا پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجام دەدەن و دوور بن لە کێشەو ناکۆکی، ژیانێکی پڕ لە خۆشی و کامەرانی بەسەر بەرن.

ئامادەکردنی د. ابراهیم طاهر معروف

هەولێر، ٢٥/١١/٢٠١٤

# بەشی یەکەم



## پێناسەی هاوسەرگیری وخێزان و گرنگی ئەم پرۆسەیە و ئامانجەکانی

**باسی یەکەم :**

**پێناسەی هاوسەرگیری**

**باسی دووەم :**

**گرنگی پرۆسەی هاوسەرگیری و ئامانجەکانی**

**باسی سێیەم :**

**بنەماکانی دامەزراندنی خێزانێکی ئاسوودەو سەرکەوتوو**

**باسی چوارەم :**

**کاریگەری خێزان لەسەر منداڵەکان**

## باسی یەکەم: پێناسەی هاوسەرگیری

**پێش هاتنە سەر باسی پێناسەی هاوسەرگیری و خێزان بە باشمان زانی کەوا بزانین خێزان لە ڕووی زمانەوانی لە چیەوە هاتووە.**

**لە ڕووی زمانەوانیدا خێزان هاتووە لە : ووشەی (بەند)(الأسر، یأسره، أسرا، إسارة، واسارا)، واتە بەندی کرد، بەند کراو، واتە خێزان: وەك بەند کردنێکی خۆویستەو خەڵك هەوڵی بۆ دەدات، چونکە وەك قەڵغانێك واتە بۆ هەردوو ڕەگەز و لە میانەی ئەوەشەوە بەرژەوەندی هاوبەش دێتە جێ و هیچ کامێك لەم دوو ڕەگەزە ناتوانێ ئەو بەرژەوەندیە دەستەبەربکات بەبێ ئەو چوونە ناو بەندو پەیمان و بەڵێنەوە.**

**خوای گەورە هەموو شتێکی بە جووتی دروستکردوە، واتە بوونەوەران لەپێکهاتەوە جووتن، ئادەمیزادیش یەکێکە لەو بوونەوەرانە کە بە جووت دروستبوون بۆیە پێویستە پەیوەندی توند هەبێ لە نێوانیان** ﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنْبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنْفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ﴾ **یس:** ٣٦

**بەرامبەر بە وشەی(الأسرة) وشەی (العائلة) هەیە واتە بژێوی دابین کردن، واتە هەوڵدان بۆ دابین کردنی رزق و رۆزی وژیانی ئەندامەکانی خێزان. لە زمانی عەرەبیدا بە: عال عیاله عولا عؤولا، أعال وأعول إذا كثر عياله.**

**لە قورئانی پیرۆز وشەی خێزان (الأسرة ) نەهاتووە بەڵام لە جیاتی ئەو وشەیە وشەی (الأهل) واتە کەس وکار بەکار هاتووە. خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿فَلَمَّا قَضَى مُوسَى الْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِ آنَسَ مِنْ جَانِبِ الطُّورِ نَارًا قَالَ لِأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَارًا لَعَلِّي آتِيكُمْ مِنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِنَ النَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾ القصص: ٢٩ ، ﴿وَاجْعَلْ لِي وَزِيرًا مِنْ أَهْلِي﴾ طه: ٢٩

**هەروەها لە قورئانی پیرۆز منداڵ ونەوەو وەچە هاتووە کەوا ئەمانەش بەگشتی خێزان پێکدەهێنن وەك لە سورەتی النحل: ٧٢ دا هاتووە.**

**خێزان پەت و داوێکی توندو پەیمانێکی بە هێزە و پەیوەستە بە فیترەت و سۆزو میهرەبانی پەروەردگارە،** ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ٢١﴾ الروم:٢١

**لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە کەوا پرۆسەی هاوسەرگیری بریتیە لە پەیمانێکی توند** (میثاق)**، واتە زۆر بە هێزترە لە وەعد وپەیمانی ئاسایی کە لە نێوان خەڵکەکان دەبەسترێ لە کاتی مامەڵەکردندا.** ﴿وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُ وَقَدْ أَفْضَى بَعْضُكُمْ إِلَى بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنْكُمْ مِيثَاقًا غَلِيظًا﴾سورة النساء: ٢١

**بۆ ئەوەی پەرتووکەکەمان زانستیانە بێت و لە ڕاستیەوە نزیك بێت پەیوەندیمان کرد بە چەند مامۆستایەکی زانکۆ بۆ ئەوەی هاوکارمان بن لە پێدانی زانیاری دەربارەی خێزان و هاوسەرگیری و کێشەکانیان. بەڕێز دکتۆر عبدالله خورشید لەسەر پێناسەی هاوسەرگیری وخێزان دەڵێ:**

**بۆ ئەوەی بزانین لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە خێزان چی یە و بنەما کۆمەڵایەتیەکان و ڕەهەندو کاریگەرییە کۆمەڵایەتیەکانی چین؟ لە سەرەتاوە پێویستە بزانین زانایانی بواری کۆمەڵایەتی و بەتایبەتیش کۆمەڵناسی چۆن دەڕوانن و چۆن پێناسەیان کردووە؟**

**لە ڕاستیدا ئێمە ناتوانین لێرەدا هەموو پێناسەکانی ئەو دەزگایە گرنگە بخەینە ڕوو، بەڵکو هەوڵ دەدەین چەند پێناسەیەکی گرنگ و هەمەلایەن بخەینە ڕوو، تاوەکو لە میانی ئەو پێناسانەوە، خەسڵەت و لایەنەکان و ئەرك و گرنگی ئەو دەزگا کۆمەڵایەتیە ڕوون بکەینەوە.**

**زانایەك بە ناوی(ولیەم ستیفنس) خێزان وا پێناسە دەکات: کە یەکەیەکە لەسەر ڕێککاری کۆمەڵایەتی دامەزراوە بە پشت بەستن بە هاوسەرگیری و لە خۆگرتنی ماف و ئەرکەکانی باوکایەتی و پێکەوە ژیانی هەردوو هاوسەر و منداڵەکانیان وپابەندی ئابووری بەرامبەر لە نێوان ژن و مێرددا.**

**زانایەکی تر بەناوی (جۆرج ئالین) دەڵێ: خێزان یەکەیەکی سەربەخۆیە، ئەندامەکانی بە پەیوەندی خوێن پەیوەستی یەکترن و لە خانوویەکدا پێکەوە دەژین... و کاروباری کۆمەڵکاری هاوبەش ئەنجام دەدەن.**

**بە شێوەیەکی دیکە (فان شیلد) ئاماژە بە خێزان دەکات کە بریتیە لە ژیانی پیاو و ژنێك پێکەوە لە سەر بنەمای پەیوەندی هاوبەش کە کۆمەڵگە ڕێگەی پێداوەو چەند ماف و ئەرکێکی کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە لەگەڵ چاودێری وپەروەردەی ئەو منداڵانەی لەو پەیوەندیەوە بەرهەم دێن.هاوسەرگیری پێناسەی زۆری هەیە کە لێرەدا بواری ئەوەمان نیە ئاماژە بە پێناسەو بۆ چوونە جیاجیاکانی بکەین، بەڵام بە پێی زۆربەی پێناسەکان، هاوسەرگیری لە شێوەیەکی ئاساییدا، بریتیە لە پەیوەندیەکی یاسایی لە نێوان پیاو وژنێکی پێگەیشتوو کە کۆمەڵێك ماف وئەرکی لەسەر**

دادەمەزرێ. هەروەها بەوە پێناسە کراوە کە: بریتی یە لە پەیمانێك کە لە ڕێگەیەوە خێزان پێك دەهێنرێ، واتە سەرەتاییکی یاخود پێشەکیەکی سروشتی یە بۆ خێزان، هەرچەندە سروشتی ئەو جۆرە پەیمانەش لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە دەگۆڕێ.

هاوسەرگیری بە بۆچوونی زۆربەی زانایان، دەزگایەکی کۆمەڵایەتی گرنگە، حوکم و یاسا و بەهای تایبەت بەخۆی هەیە، لە کلتورێکەوە بۆ کلتورێکی دیکەش جیاوازی و تایبەتمەندی خۆی هەیە.

لەو پێناسانەی سەرەوە دەگەینە ئەوەی کە خێزان: بریتیە لە بونیادێکی کۆمەڵایەتی کە لەسەر پەیوەندی خزمایەتی دامەزراوە(ڕەچەلەك و هاوسەرگیری)، لە کۆمەڵێك پەیوەندی کۆمەڵایەتی کە فەرهەنگی کۆمەڵگە دەستنیشانیان دەکات، لە نێوان ئەو خزمانەی پێکەوە دەژین و کارلێك دەکەن، وەك یەکەیەکی یەکگرتوو.

هاوسەرگیری وەك دەزگایەکی کۆمەڵایەتی: هاوسەرگیری ئەو دەزگا کۆمەڵایەتیەیە کە ڕێگە بە دوو مرۆڤی پێگەیشتوو دەدا کە سەر بە دوو ڕەگەزی جیاوازن (نێرومێ) کە خیزان پێکەوە بنێن وپێکەوە بژین. بەڵکو زاوزێش بکەن و وەچە بخەنەوە، ئەو وەچەیەش بە تاك و توخی ئەو دەزگایە بزانرێ و لەلایەن کۆمەڵگەوە دانی پێدابنرێ. هاوسەرگیری پەیوەندیەکی شەرعی یاخود یاسایی یان کۆمەڵایەتیە کە کلتوری کۆمەڵگە دانی پێدادەنێ.

شایەنی باسە کە هاندەری هاوسەرگیری گرنگیەکی زۆری هەیە بۆ بناغە لەسەر دانانی پەیوەندی و ڕەفتاری هاوسەرەکان لە ئایندەدا. بۆ بەردەمبوونی ژیانی هاوسەرگیری و دووربوون لە کێشەو مەترسیەکان، گرنگە هەندێك خەسڵەت لە ئافرەتدا بوونی هەبێت. ئەو خەسلەتە بنەڕەتیانەش کە لە ئافرەتدا هەبێ، جوانی و ئاینداری و کچێتی و تەمەنێکی دیاریکراوە یان نزیکە لە تەمەنی کوڕەکە. لە کوڕیشدا ئاینداری و ئاکاری بەرزو توانای بەڕێوەبردنی خێزان خەسڵەتی بنەڕەتین، بێ گومان لە ش ساغی وتەندروستی جەستەیی و دەرونیش مەرجێکی گرنگ و پێویستە بۆ هەر یەکێکیان.

<u>لەو بارەیەوە د. عمر پەتی دەڵێ:</u>

<u>هاوسەرگیری</u>: پرۆسەیەکە کە لەبەردەم خەڵکیدا دەبەسترێت بۆ تەرخانکردنی سیفەتە سەرەکیەکانی خۆشەویستی بۆ یەکتر. دەتوانین بڵێین (هاوسەری) واتا: هاوبەشی لە سەرین

(بالیف) ، (سەریناو). یاخود هاوبەشی سەرجێ، بەواتایەکی تر هاوبەشی لە ژیانی خێزانیدا. لە هاوسەرگیریدا پەیمانی ئارامبەخشی، ئارەزوو دەگۆڕێت بۆ خۆشەویستی. لە لایەکی ترەوە هاوسەرگیری پێوەرە بۆ خۆشەویستی و گەشەکردن، چونکە بە بەردەوامی لە هەوڵدایە بۆ بەدەستهێنانی یەکبوونی راستەقینە لە نێوان هەردوو خۆشەویستەکە.

پەیمانی هاوسەرگیری: بەئاشکرایی و ئاهەنگی بۆ دەگرێت، دوو خۆشەویستەکە لە بەرامبەر نوێنەرانی هەموواندا ( ئینجا شارستانی بێت یاخود ئاینی یاخود هەردووکیان) بە ئامادەبوونی گەواهی دەرەکان رادەگەیەنن و دەریدەبڕن. لەبەر ئەوەی مرۆڤ بە سروشتی خۆی بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتیە، بۆیە پەیمانی هاوسەرگیری چەسپاوی خۆی وەدەست ناهێنێت تەنها بە راگەیاندنی نەبێ بەرامبەر بە کۆمەڵانی خەڵکدا.

کۆمەڵێك لە زانایانی تری کۆمەڵناسی پێناسەی خێزان بەم شێوەیە دەکەن: خێزان بریتیە لە خانەیەکی زیندوو، پێکهاتووە لە باوك و دایك و منداڵەکان، یان تەنها پێکهاتووە لە دایك و باوك، هەریەکێك لەو ئەندامانە رۆڵی تایبەتی خۆی هەیە لە کەیان و بوونی ئەو خێزانە، کاریگەریان لەسەر خێزان هەیە وەیان خێزان کاریگەری لەسەر ئەو تاکە هەیە.

لە زانستی کۆمەڵناسی، خێزان ئەو خانە سەرەکیەیە لە کۆمەڵگە وگرنگترین پێکهاتەی سەرەتایی یە، وپێکهاتووە لە چەند تاکێك کە پەیوەندی نزیکی و سۆزو بەزەیی پێکەوەیان گرێ دەدا، وە خێزان بەشدارە لە چالاکیەکانی کۆمەڵگە لە هەموو بوارەکانی ماددی و روحی مەعنەوی وئابووری.

پێناسەیەکی تری خێزان: بریتیە لە بەیەکگەیشتنی نێوان هەردوو هاوسەر بە مەبەستی هێنانەکایەوەی منداڵ و چاودێری کردنیان و زیادکردنی ژمارەی کۆمەڵگە بە بەردەوامی کە زۆر پێویستە بۆ بەردەوام بوونی ئەو کۆمەڵگەیە لە ژیاندا.

ئەم پێناسەیە کارو ئەرکی خێزان دیاری دەکات کە:

١- پەیگەیەکە ئەندامەکانی خێزان تیایدا هەست بە سۆزو خۆشەویستی دەکەن.

٢- هەردوو هاوسەر ئەو غەریزە فیتریە تێر دەکەن لە رووی جەستەییەوە.

٣- هەردوو هاوسەر ئەرکی بژێوی وچاودێری بەرهەمی ئەو بەیەکگەیشتنە دەکەن لە نێوانیاندا ئەویش منداڵ و نەوەی دوارۆژە.

## باسی دووەم: گرنگی پرۆسەی هاوسەرگیری و ئامانجەکانی

**ئاینی پیرۆزی ئیسلام گرنگی زۆری بە خێزانداوەو هانی گەنجەکانی داوە کەوا زوو پرۆسەی هاوسەر گیری ئەنجام بدەن، بۆ پاراستنی شەهوەت ونەفسی خۆیان، وە هۆکارێکی زیادبوونی بەرەکەت و رزق و رۆزیە. خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿وَأَنْكِحُوا الْأَيَامَى مِنْكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِنْ يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ النور: ٣٢ ، **هەروەها پێغەمبەری پێشەوامان هانی گەنجەکانی داوە کەوا ئەوەی لە توانای دایە هاوسەرگیری ئەنجام بدات چونکە هۆکاری چاوپۆشین و پاراستنی ئەندامی زاوزێیە.** :((يا معشر الشباب من استطاع منكم الباءة فليتزوج، فإنه أغض للبصر وأحصن للفرج..))

**بەرێز د. عبدالله محمد قادر ژمارەیەکی لە ئامانج و سوودەکانی هاوسەرگیری بۆ نوسیووین بە کورتی لەم خاڵانەی خوارەوە خۆی دەگرێتەوە:**

**یەکەم: ڕەزامەندی خوای گەورەو لێ نزیکبوونەوەیەتی و سوننەتی هەموو پێغەمبەرەکانە کەوا هاوسەرگیری بکەن، بەم شوێنکەوتنە خێرت بۆ دەنوسرێ.**

**دووەم: پاراستنی نەوەکانە و هۆکارێکە بۆ زیادبوونی ئەوەی دوارۆژ وناوی بنەماڵەوە خانەوادە و بەهێزکردنی کۆمەڵگەیە، هەروەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: (هاوسەرگیری بکەن تاوەکو ئوممەتی من زیاد بێت) وە لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ (لەوانەیە منداڵێکی ببێت بێتە هۆکار بۆ پڕکردنی زەوی بە وشەی** لا اله الا الله**).**

**سێیەم: هاوسەرگیری نیوەی ئیمانە: چونکە بەو هۆیەوە هەردوو ڕەگەز خۆیان دەپارێزن لە کاری ناشیاوی وەك تەماشاکردن و زیناو کەوتنە ناو فەسادو بەد ڕەوشتی، هەروەك پێغەمبەری پێشەوا فەرموویەتی: (هاوسەرگیری نیوەی ئاینە، تەقوای خوا بکەن و خۆشتان بپارێزن لە نیوەکەی تر).**

**چوارەم: پاراستنی کۆمەڵگەیە لە بڵاوبوونەوەی بەد ڕەوشتی و فەساد بەتایبەتی بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشیەکانی جینسی کە ئێستا زۆر بڵاو بۆتەوە، وەك سوزەنەك و فەرهەنگی و هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی و ئایدز و زۆری تر لە نەخۆشیەکانی بەکتیری و ڤایرۆسی و کەڕوەکان.**

پێنجەم: دوور کەوتنە لە ناو هەوسەنگی دەرونی و نەخۆشیەکانی دەرونی و خەمۆکی و خەو زڕان و پەشێوی.

شەشەم: هۆکارێکی زیادبوونی ڕزق و ڕۆزیە، هەروەك پێغەمبەری پێشەوا ﷺ فەرموویەتی: (ماڵ بۆ خۆتان دابنێن، سەرچاوەی ڕزقە). هەروەها هۆکاری زیادبوونی چاکەو حەسەناتە.

حەوتەم: خۆشی و کامەرانیە: هەروەك پێغەمبەری پێشەوا ﷺ فەرموویەتی: (لە خۆشیە گەورەکانی ژیان ئافرەتێکی چاك وپاکە).

هەشتەم: ڕەوشت بەرزی وگەیشتن بە پلەی بەرزی ئەخلاق لەناو کۆمەڵگە.

نۆیەم: ڕێکخستن و کۆنترۆڵی چالاکی جینسی و پاك ڕاگرتنی.

دەیەم: ڕاهێنانە لەسەر ئەرکی لێپرسراویەتی وچۆنیەتی بەڕێوەبردن.

یانزەیەم: بەرجەستەکردنی ماناکانی هاوسەنگی کۆمەڵایەتی و روحی پێکەوە ژیان و هاوکاری.

دوانزەیەم: هاوسەگیری بکە و درەنگ بمرە لە وتەکانی د. عومەر پەتی:

توێژینەوەیکی نوێ دەریخستووە، دروستکردنی خێزان مەترسی مردنی پێشوەخت ناهێڵێت بەتایبەتی لە نێو ژناندا. بە پێچەوانەی ئەو وتەیەی کە گوایا خستنەوەی منداڵ تەمەن کورت دەکاتەوە، دەرکەوتوە کە پێچەوانەکەی راستە. هەروەها توێژینەوە دەریخستووە مردنی پێشوەخت بەهۆی نەخۆشی دڵ و شێرپەنجە و ڕووداوی لەناکاوەوە لە نێوان ئەو ئافرەتانەدایە کە بێ منداڵ ماونەتەوە، چوار ئەوەندە بووە بە بەراورد لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی کە خاوەنی منداڵی خۆیان بوون. هەروەها بە ڕێژەی ٥٠٪ کەمتر بووە لەو ئافرەتانەدا کە منداڵیان هەڵگرتۆتەوە. بەهەمان شێوە ڕێژەی مردن دوو ئەوەندە بووە لە نێوان ئەو پیاوانەدا کە ژیانی هاوسەریان پێکنەهێناوە، هەروەها ڕێژەی نەخۆشیەکانی مێشك جیاوازی نەبووە لەو خێزانانەدا کە منداڵی خۆیان هەبووە، یان خاوەنی هیچ منداڵێك نەبوون.

## باسی سێیەم: بنەماکانی دامەزراندنی خێزانێکی ئاسوودەو سەرکەوتوو.

بۆ ئەوەی هاوسەرگیری لە سەر بنەمای زانستی و ژیرانە دابمەزرێ وبتوانرێ سەرکەوتن و پاشە ڕۆژی ڕوناکی بۆ مسۆگەر بکرێ پێویستە هەندێك هەلومەرج لەبەرچاو بگیرێن. بەڕێز د. عبدالله خورشید لەم بارەیەوە باسی ئەو بنەمایانەمان بۆ دەکات و دەڵێ:

یەکەم: لە کاتی هەڵبژاردن:

١- پێویستە جوانیەکی مام ناوەندو ژیری و هەستی بەرپرسیاریەتی و بەهاو پابەندبوونی ئاکاری ئاینی لەبەرچاوبگیرێ ، ج لەلایەن کوڕەکەوە یاخود لەلایەن کچەکەوە.

٢- نزیکی وهاوسەنگی لەبەرچاو بگیرێ، لە ڕووی پلەوپایەو بڕوانامەو ئاستی ئابووری و تەمەن و ژینگەو...تاد. چونکە تەسك کردنەوەی مەوداو جیاوازی نێوان هاوسەرەکان لەدوای پێکهێنانی خێزان کارێکی ئاسان نیە.

٣- باشتر وایە لە هەڵبژاردنی هاوسەردا(کچ یان کوڕ)هەندێك شارەزاییان لەبارەی یەکترەوە هەبێ، لە ڕووی دیدو بیرکردنەوەو هەڵسوکەوت و هەندێك بابەتەکانی ژیانی ڕۆژانەی ناو خێزانیش، چونکە مرۆڤ تا ڕادەیەکی زۆر دەکەوێتە ژێر کاریگەری ژینگەوە، بە تایبەتیش خێزان وخزمانی نزیك و گەڕەك و هاوڕێیانی قوتابخانەو وکارو ..تاد.

٤- هەر دوو لە هاوسەر، بەباشی وردبنەوە لە خەسڵەت و تایبەتمەندی کەسی بەرامبەر، بەڵام هەرگیز بەتەمای ئەوە نەبن کە ئەو کەسە دەگاتە ئاستی خوازراوی ١٠٠%. لەبەر ئەوەی مرۆڤەو وفریشتە نیە، واتە بێ کەم و کوڕی نیە.

٥- لە خاڵی چوارەمەوە دەبێت دوو ئەنجام بە دەست بهێنیین، یەکەمیان: ئێمەش هەڵەو کەم وکورتی لە خۆماندا لەبەرچاو بگرین بۆیە بەرامبەر بەبێ هەڵە نەبینین، پاشانیش پێویستە هەوڵی چاککردنەوەی هەڵەکانی بەرامبەر بدرێ و هەموار کردنی تێدا ئەنجام بدرێ.

٦- هەندێك جار ڕەنگە بوونی خەسڵەتێك لە بەرامبەردا هەڵەو تاوانێك نەبێ، بەڵکو ئەو خەسڵەت وبیرو بۆچوونە لە ژینگەیەك بۆ ئەو دروست بووە بۆی هەیە لەگەڵ پێکهاتەی خێزان لەو خەسڵەتانە دوور بکەوێتەوە. ڕەنگە بەرامبەریش هەمان ڕەخنەو بیرو بۆچوونی ئەرێیان لە بارەی ئێمەوە هەبێ و پێویست بکات ئێمەش هەموارکردن لە خۆماندا ئەنجام بدەین.

٧- زۆر بەزەقی وڕاستەوخۆ هەڵەکانی بەرامبەر گەورە نەکەینەوە، ئەگەرچی تەنانەت لە بیروبۆچوونی نهێنی وتایبەتی خۆشماندا بێ، چونکە ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە لایەنە ئیجابیەکانی لەلا کاڵ دەکاتەوە و چاوەڕوانی چاکەمان لەلا کەم دەکاتەوە.

٨- لە هەموو کارێکدا، بەتایبەتیش هاوسەرگیری، ڕاوێژکردن بە خەڵکی بە ئەزموون وشارەزا ودڵسۆز، کارێکی زۆر پێویست و گرنگە، چونکە دواکەوتن و پرس و ڕاوێژێکی چەند ڕۆژە بنچینەیەکی پتەوترو زەمینەیەکی لە بارترت بۆ دەرەخسێنێ.

٩- بە هیچ شێوەیەك لە ڕابوردووی ئەو کەسە نەکۆڵیتەوە، بە تایبەتی لە خودی خۆی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، چونکە مرۆڤ بێ هەڵەو کەم و کوری نیە. مادام بەگشتی ڕای لێبێ وپرس وڕاوێژت کردبێ... خۆت مەخەرە هەڵوێستێك کەسبەی هەڵەکانی وەرگری و پێی قایلبی و پاشانیش ئەو هەڵانە دوبارە ببنەوە، یان بەوچاوە بەردەوام تەماشای بکەی.... یانیش کە هەڵوێستێکت لێ بینی وپێشتر دانی بەو جۆرە هەڵانە نەنابوو، ئەوجا بزانی کاتی خۆی درۆی لەگەڵ کردووی.

١٠- باشتر وایە هەندێ بابەت لە نێوان کوڕو کچ باس بکرێ وڕێککەون لەسەری. واتە بنیاتنانی ژیانێك کە بە دڵی هەردوولا بێت شوێنەواری بیرو بۆچوون وهەڵسووکەوتی هەڵەی ڕابووردوو کاریان تێ نەکا.

١١- هەر یەکێك لە دوو لایەنەکە، پێویستە هیچ کامێکیان ئەزموونێکی تاڵی ڕابوردوو نەهێننە بەرچاو.. بۆ نموونە شکستی خۆی یان خزم یان دراوسێیەك نەهێنێتە بەرچاو لەگەڵ هاوسەرەکەی. بۆیە پێویستە ئەو جۆرە بیروبۆچوونە خراپانە لە مێشکی خۆی دەربکات و باش بزانێت لە هەموو دونیادا دوو کەس دەقاو دەق بەیەك ناچن.

١٢- با کەسی ئامادەبوو بۆ هاوسەرگیری ڕێگە نەدا بە کەسی تر کە خۆیان لە هەندێك شت هەڵبقورتێنن، ئەگەرچی کەسی جێگەی متمانە وڕاوێژپێکراویش بێت، چونکە هیچ کەس ناتوانێ بەردەوام بە چاوی خەڵکی شتەکانی ببینێ، بە تایبەتیش هەندێك خەسڵەت و ڕەنگ و ڕووی جەستەو جوانی ومیزاج و کەسایەتی لەبەرکردنی جل و بەرگ و شێوازی ڕەفتارو هەڵسوکەوت و ئاستی ڕۆشنبیری ....تاد.

دووەم: لە دوای پێکهێنانی هاوسەرگیری و دامەزراندنی خێزان.

١- لە سەرەتاوە وەکو مرۆڤێکی تازە لە دەزگایەکی وەکو خێزان، پێویستە نەشارەزایی وهەڵەو کەم و کوڕی بە بابەتێکی ئاسایی بزانین و لە یەکتری بە بیانو نەبین ... واتە هەردوو هاوسەر دەرفەت و کاتێك بڕەخسێنن بۆ یەکتر تاوەکو لەگەڵ بارودۆخی تازەی خێزاندا دەگونجێن وڕادێن.

٢- هەر کاتێك هەستت بە هەڵە وکەمو کوڕی بەرامبەرت کرد پێویستە بیر لە چەند شتێك بکەیتەوە:

أ- ئەویش سەرنجی هەندێك هەڵەو کەم و کوڕێتی تۆی داوە، جا باسیان بکات یان نەیکا.

ب- ئەو هەڵانە هی ژینگەی پێشوویەتی و ڕەنگە بە چاو لێکردنی تۆو خێزانەکەت پاش ماوەیەکی کەم ڕەفتارو گوفتارو بیروبۆچوونی خۆی چاك بکاتەوە.

ت- ئەگەر ماوەیەکی پێ بچێ و لە هەڵەکانی بەردەوام بوو، ئەوا بە شێوازێکی مەنتقی و ژیرانە هەڵەو کوم و کوڕیەکانی بۆ چاك بکەیتەوە بەبێ بریندار کردن و ئازاردانی هەست و دەروونی.

پ- هەڵەکانی زۆر گەورەو ناشرین پێشان نەدەی و تێی بگەیەنی کە هەموو کەس هەڵە دەکات و تۆش ئامادەی هەڵەکانی خۆت چاك بکەیەوە، کاتێك هاوسەرەکەت ئاگادارت دەکاتەوە.

٣- لە کاتی کێشەو نەگونجان لە سەر هەر بابەتێك هەوڵبدە بەو شێوەیە بدوێی و ڕێگە چارە بدۆزیتەوە: کە بەرامبەرەکەت لێت وەرگرێ و باشتریشە وابزانێ کە لە ئەنجامی گفتوگۆ لەگەڵ تۆدا خۆی چارەسەرەکەی دۆزیتەوە.

٤- ئەگەر ناچار نەبن هیچ کاتێك کێشەکانتان نەبەنە دەرەوەی خێزان و خەڵکی تێکەڵی بابەت و وردەکاریەکانی ژیانتان مەکەن، مەگەر ناچار بن و هیچ چارەسەرێك بۆ ئەو کێشەیە نەدۆزنەوە... ئەو کاتیش کەسانی دڵسۆزو شارەزاو بە ئەزموون بکەنە ڕاوێژکار و هەڵگری ڕازتان.

٥- جاری وا هەیە کێشە لە بێزاری دووبارە بوونەوەی ژیانێکی ئاسایی بێ گۆڕان پەیدا دەبێت (واتە ڕۆتین)، بۆیە سەردانی خزم و برادەری باش و خەڵکی خاوەن ئەزموون کێشەکەتان لەبەر چاو سووك دەکات، ڕەنگە سەیران و دەرچوونی دەرەوەش بە سوود بێت لێرەدا.

٦- هەریەك لە هاوسەرەكان پێویستە ڕێگە نەدات بە خەڵكی یان كەس وكار كە خۆی لە كاروباری ناو خێزانە تازەكەتان هەڵبقورتێنێ، گەر چی نیازیشی باش بێت، مەگەر پێدانی ئامۆژگاری و ئاراستەكار بۆ هەر یەكێك لە هاوسەرەكان بە تەنها، یانیش بە شێوازی ڕێكو پێك وپەسەند لە لایەن هاوسەران.

٧- خۆ پڕچەككردن بە زانیاری ئاینی ودەروونی وكۆمەڵایەتی و خێزانی، چونكە نەزانی و نەشارەزایی كێشەو گرفتی زۆر لەناو خێزان و لە نێوان هاوسەرەكاندا بەدی دەهێنێ.

٨- ناو بەناو بۆنەیەك بكرێتە بیانوو بۆ پێشكەش كردنی دیاری بەیەكتری، دیاریش كاریگەری زۆر سەیری هەیە لە نوێكردنەوەی بیرەوەری خۆش و نوێكردنەوەی تێڕوانینی ئیجابی بەرامبەر بە یەكتری، بەتایبەتی بیرەوەری هاوبەش وەك مارە كردن و گواستنەوەو سەفەرو ...تاد.

٩- ستایش كردنی هاوسەر لەلایەن هاوسەرەكەیەوە لە بەردەم خزم و میوان و كەسانی نزیك و دڵسۆزی هەردوولا، كار لە دڵ ودەروونی دەكات و خۆشەویستی لا زیاد دەكات.

١٠- بۆ ئافرەت واچاكە هاوسەرەكەی ناوبەناو ستایشی جوانی خانەدانی ودەستاوخۆشی و دڵسۆزی ودەست ڕەنگینی بكرێت، بەڵكو دەبێت بیسەلمێنێ كە چاوی ئەو پیاوە هیچ ئافرەتێكی تری وەك ئەو نایەتە بەرچاو. ئافرەتیش دەتوانێ بە پیاوەتی و ئازایەتی وماندووبوون لە پێناوی خێزانەكەی ستایشی بكات و خۆشەویستی و دڵسۆزی خۆی بەردەوام بۆ تازە بكاتەوە.

١١- كاتێك كێشەیەك دروست دەبێت ، پێویستە چاكەكانی نێوان هاوسەرەكان پشت گوێ نەخرێن وكێشەكانیش نابێ لە قەبارەی خۆیان زیاتر گەورە بكرێتەوە...ئەوەش لەبەرچاو بگیرێ كە هەموو كێشەیەك كاتیەو چارەسەریشی هەیە.

١٢- خۆشم دەوێی لەگەڵ هەندێك گاڵتەو قسەی خۆش، كە هیچی تێناچێت، بەڵكو دەبێتە هۆی دڵخۆشی و تەبایی و لێك نزیكبوونەوەی بەردەوام.

١٣- پێویستە بەردەوام لە خواترسان ودادگەری و ستەم نەكردن، چرای ڕووناككەرەوەی بەردەم هاوسەران و مرۆڤەكان بێ لە گشت بوارەكانی ژیاندا... دەبێ ئەوەش بزانین مرۆڤ چی بچێنێ ئەوە دەدوورێتەوە، واتە ناكرێت كەسێك كەسی بەرامبەری خۆش نەوێ و قوربانی نەدا لە پێناوی تەبایی و خۆشەویستی بەرامبەرەكەی ، چاوەڕێی ئەوەبێ كە بەرامبەرەكەی خۆشی بوێ و گوێڕایەڵی بێ وئارامی وبەختەوەری پێببەخشێ.

١٤- بۆ ئەوەی گوڵ بۆن بکەیت و جوانیەکەی ببینی پێویستە شەتڵەکەی بچێنی، ئەوەك بەپێچەوانەوە... بۆی چاککەو خۆشەویستی و ئارامی ببەخشە، تاوەکو کاردانەوەی جوان و گوڵ ئاسا لێی بچنی. گوتراویشە ئەوەی درك بچێنی گوڵ نادورێتەوە.

١٥- لە کۆتاییدا پێویستە لە ژیانی هاوسەرگیریدا هەمیشە گەشبینی و گومانی باش سەرکردەو رێنیشاندەری هاوسەرەکان بێ و بەهیچ شێوەیەك بەدبینی و بەدگومانی نابێت سەر لە هاوسەران بشێوێنێ و رەفتاری هەرچەشنەو هەڵەیان پێ ئەنجام بدا، تورەیی وبێ ئارامیش بەردەوام ئاکام و رەفتاری خراپ و زیانبەخشی لێدەکەوێتەوە.

## باسی چوارەم: کاریگەری خێزان لەسەر منداڵەکان

پێویستە لەسەر باوکەکان ببن بە پێشەنگ بۆ نەوەکانیان و لەسەر نەوەکانیش پێویستە لەسەر ڕێگەو شوێنی باوکەکانیان بڕۆن وچاولێکەریان بن لە ئاکارو هەڵسوکەوت و دەربڕینی وشەو بیروڕای جوان.

جلاس پوم دەڵێ: هەرچەندە ڕێگەنیشاندان و پەروەردەی منداڵ بگاتە پۆپکە لەلایەن دایك و باوکەوە، بەڵام نابێت ئەوە فەرامۆش بکەین کەوا دروستکردنی کەش وهەوایەکی پڕ لە خۆشەویستی و چاودێری و دادپەروەری و سۆزو ناز هەڵگرتن باڵێکی زۆر گرنگە بۆ گەشەی منداڵ و گەیشتنە ئامانجەکانی. ئەگەر دایك و باوکان نەیانتوانی ئەو کەش وهەوایە دابین بکەن بۆ نەوەکانیان، ئەوا نەوەکانیان مەحروم و بێبەش دەکەن لە بەشێکی گرنگی پێگەیاندن  کە هەرگیز ناتوانرێ بەهیچ شێوەیەك جێگەی بگرێتەوە، هەرچەندە قوتابخانەو کۆمەڵگەو ئاین و داب ونەریت گاریگەری هەیە لەسەر گەشە و پێگەیشتنی منداڵ، بەڵام هیچ کامیان ناگاتە ئاستی ئەو سۆز و خۆشەویستی و ئامێزگرتنەوەی لەماڵەوە پێی دەبەخشرێ.

زانایانی کۆمەڵناسی دەڵێن: ئەو خۆشی و سەعادەت و دادوەریەی لە ناو خێزاندا دەبەخشرێ بە منداڵ وا دەکات دڵنیایی و ئاسوودەییەکی بۆ دروست بێت بەناو دڵ ودەروونی، دوای مردنی باوکیشیان ئەو ئاسوودەییە کاریگەری هەردەمێنێ وزیاتر دەتوانێ بەرەنگاری ناخۆشیەکانی ژیان بێتەوەو سەرکەوتووبێ و بەشدار بێت لە چالاکیەکانی کۆمەڵە و هەست بە ڕۆحی لێپرسراویەتی بکات.

زانایانی پەروەردە زۆر جەختیان لەسەر ئەوە کردوە کەوا دایك و باوکان زۆر گرنگی بە سۆزو خۆشەویستی بدەن بۆ منداڵەکانیان، چونکە هەر ئەوەیە وادەکات دووریان بخاتەوە لە دڵەڕاوکێ وخەمۆکی هەروەك ڕێکخراوی جیهانی بۆ چاودێری منداڵان لە ڕاپۆرتیکدا بڵاوی کردۆتەوەو تیایدا هاتووە:

(بێبەشبوونی منداڵ بەهۆی نەمانی باوکی لە ماڵ جا چ کاتی بێت یان هەمیشەیی بەهۆی مردن، تووشی خەمۆکی وناهاوسەنگی دەبێت و هەست بە بێ هێزی وگوناه دەکات، دەبێتە خاوەنی میزاجێکی هەڵگەڕاوەو توند، داخوڕانی دەرونی و هەستی سۆزی خێزانی کەم دەبێتەوەو لە جیهانی خەیاڵ و ئەندێشەدا دەژیت، ئەگەر لە قوتابخانەدا بوو دەبینین هەندێك نەنگی و کەم و

کوڕی لێمردەکەوێت وەك گرانی لە قسەکردن و خوڕەوشتی بەد و کورتی لە گەشەی هەست و سۆز) زانایانی پەرمردە دەڵێن: باشترین میرات کە باوکان بۆ منداڵەکانیان جێدەهێڵن بریتیە لەو چەند خولەکەی کە ڕۆژانە دەیبەخشنە منداڵەکانیان و بەشداری ژیانیان دەکەن.

زانایانی کۆمەڵناسی دەڵێن: باشترین ڕێگە بۆ پێشگرتن لەسەر لادان ولاڕێ بوونی منداڵ بریتی یە لە دۆزینەوەی باوکان لەسەر شەقامەکان و کۆلانەکان لە درەنگی شەو وگێڕانەوەیان بۆ ماڵەوە.

ئەگەر باوکان بە ئەرکی خۆیان هەڵسن بەرامبەر منداڵەکانیان لە چاودێری وبژێوی و هاوڕێیەتی کردنیان بە شێوەیەکی دروست و بەردەوام ئەوا ئەو منداڵە سیفات و هەڵسوکەوتی جوان لە خۆ دەگرێت و دوور دەکەوێتەوە لە لادان و خوڕەوشتی نزم و کێشەنانەوە بۆ کۆمەڵگە.

شاعیری بەناوبانگ ئەحمەد شەوقی دەڵێ:

هەتیوو ئەو کەسە نیە کە وا باوکی ڕۆڵی کۆتایی هات لە هەڵگرتنی هەم و غەمی ژیان بۆتە کەسێکی زەلیل

بەڵام هەتیوو ئەو کەسەیە کەوا دایکی هەیەو پشتگوێی خستووەو باوکیشی کەسێکی زۆر مەشغول.

# بەشی دووەم

## کێشە کۆمەڵایەتی و ئابووریەکان



**باسی یەکەم:**

**چەند هۆکارێکی لێکترازانی پەیوەندی خێزانی**

**باسی دومم:**

**پۆلێن کردنی هۆکارەکانی کێشەکانی ژیانی هاوسەرگیری لەلایەن زانایانی کۆمەڵناس و ئابووری و دەروونناسەوە**

**باسی سێیەم:**

**درێژەی سێ کێشە بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە**

**باسی چوارەم:**

**هاوسەرگیری ئەلیکترۆنی و لایەنە نێگەتیڤەکانی ئەو جۆرە هاوسەر گیرییە**

**باسی پێنجەم:**

**هەندێك لە ئوسلوبی کرداری بۆ ارەسەری کێشەی هاوسەرگیری**

**باسی شەشەم:**

**هەندێك لە سودەکانی کێشەی نێوان هەردوو هاوسەر**

## باسی یەکەم: چەند هۆکارێکی لێکترازانی پەیوەندیەکانی خێزان

بەرێز د. عبداللە خورشید پسپۆری کۆمەڵناسی و مامۆستای زانکۆ هۆکارەکانی لەم چەند خاڵەی خوارەوە خستەڕوو کە لە کۆمەڵگەی کوردەواری بەدی دەکرێت. هۆکارەکانیش ئەمانەن:

یەکەم: فەراهەم نەبوونی بنەما سەرەکیەکانی ژیانی خێزان، بە تایبەتی لەلایەنی ئابوری و سەقامگیری و ئارامیەوە .

دووەم: جیاوازی فەلسەفەو بیرو بۆچوونی هەریەکەی لە هاوسەرەکان لەبارەی ژیانەوە. دیارە لەماوەی دەستگیرانی و پێشتریش هەریەکەیان ئاگاداری بیروبۆچوون و ئارەزو وخواستەکانی ئەوی دیکە نەبووە، تاوەکو خۆی بۆ ئامادە بکات لەگەڵ ژیان و گونجاندا.

سێیەم: جیاوازی ئاسۆیی رۆشنبیری هاوسەرەکان و جیاوازی پێوەرەکانیان لە بواری ئاینی و ئاکارو ئادابی رەفتار. ئەم جیاوازیەش بە روونی دوای پێکەوە ژیان و کارلێکردنی ناو خێزان دەردەکەوێت.

چوارەم: زاڵبوونی کەسایەتی یەکێك لە هەردوو هاوسەرەکان بەسەر ئەوی دیکەدا، بە شێوەیەکی ئاشکراو بەرجەستە. ئەگەرچی سەرداری وباڵادەستی هی پیاو بێ لە خێزاندا بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئافرەت ملکەچی بەردەوام و کۆیلە بێ لە خێزاندا بۆیە پێویستە لێك تێگەیشتن و رێککەوتن و گونجان باڵ بکێشێ بەسەر گشت پەیوەندیە بەرامبەرەکانی ناو خێزان. جاری وا هەیە یەکێك لە هەردوو هاوسەرەکان دەبێتە شوێنکەوتەی ئەوی تر، جا بە ئاگاداریەوە بێت یان بێ ئاگایانە، بەڵام هەندێ جاری دیکە هەریەکەیان هەڵوێستی دژایەتی تەواو وەردەگرێ لەبەرامبەر ئەوی دیکە، بێ باکانە لە تێکچوونی یەکێتی خێزانی ویەکگرتنی، هەریەکەشیان لایەکانی دژایەتی بەتوندی دەست پێوەدەگرن و پێشبڕکێش لە نێوانیاندا لە زیادو کەمدا بەردەوام دەبێت، دەمە تەقێ و بەردەق بەردەق جێگەی لەیەکتر گەیشتن دەگرێتەوە، ئینجا هەڵوێستەکان تێکدەگیرێن و بۆچوونەکان دژ بەیەك دەبن ومامەڵەو کاریان لەگەڵ یەك دەکەوێتە قەیرانەوەو بارگرژی زۆر توندو تیژ دەبێ و هەرەشەی هەرەس هێنانی بونیادی خێزانیش دەکات.

پێنجەم: دەرکەوتنی هەندێك ئاراستەی تاکگەرایی و خۆویستی، بە شێوەیەکی ئاسایی ژن و مێرد لەسەرەتای ژیانی هاوسەرێتیدا، زۆر دڵگەرمی ژیانێکی پڕ لە خۆشی و هاوسەرێتی بن کە لەسەر بنەمای هاوکاری ودڵسۆزی و خۆشەویستی بەرامبەردا دابمەزرابێ ، بەڵام پەیوەندی بە

جیهانی دەرەوەیە بەتایبەتیش کە ژنەکە لە دەرەوە کار بکات، چەندان ئەزموون و بارودۆخ و لادان لەلایەن خەڵکی دیکە دەبێت، هەموو ئەو ئەزموون و تێبینیانە دەبێتە هۆی پەیدابوونی هەندێ بیرو بۆچوونی مەزەندەکراو (خیاڵ) لە ژیانی هاوسەرێتی دا. ئەمجا بۆچوونە کەسێتی یەکان دەردەکەون و هەریەکێك لە ژن و مێردەکە دەست دەکات بە دامەزراندنی ژیانی تایبەتی خۆی، لە گەڵ کۆمەڵێك مەیل و ئارەزوو بۆ ئاراستەی تایبەتی، لە سەر بنچینەیەکی تاکە کەسیەتی دوور لەبەرژەوەندی خێزانەکە. ئەو مەیل و ئاراستە تاکە کەسیانەش بەرەبەرە فراوان دەبن، تاکو زیان بە یەکێتی خێزان دەگەیەنێ، ئەو یەکێتیەی کە پێویستی بە هاوکاری وپاڵپشت ی کاری هاوبەش هەیە، لەگەڵ باڵ کێشانی هاوسۆزی لەگەڵ بەرامبەردا.

شەشەم: مەیلی جوتبونیش کاریگەری هەیە لە زیادبوونی بارودۆخی بارگرژی، ئەمەش چەند لایەنێکی هەیە، وەك: جیاوازی تەمەن و پەیدابوونی چەند نەخۆشیەکی دەروونی و پەیوەست بە زاوزێ و ئارەزووی توانای جووتبوون... تاد.

حەوتەم: هەندێ هەڵسوکەوتی نا ئاسایی بە هۆی لاوازی مێشك و هەرەس هێنانی عەقلی و نەخۆشیە درێژخایەنەکانەوە.

هەشتەم: هەندێ خوی زیانبەخش و لادانی ڕەفتارو ڕواڵەتەکانی ڕەفتاری دوور لە ئادابی گشتی. ئەم جۆرە خوو ڕەوشتانە یەکێك لە هاوسەرەکان دوور دەخاتەوە لەوی دیکە و بەناچاری نەبێ و پێکەوە کۆنابنەوەو پێکەوەش هەڵناکەن مەگەر بە ئاخ و ئۆف و دڵگرانیەوە نەبێت.

نۆیەم: نەمانی سۆزە خێزانیەکان: جاری وا هەیە کە سۆزی هاوسەرێتی لەلای یەکێك لەو دوو هاوسەرە کزو لاواز دەبێت، لە بە هەر هۆیەکەوە بێت، پاش ماوەیەك کە زۆر بێت یان کەم ئەمجا ژیانی هاوسەرێتی بەتاڵ دەبێت لە خۆشەویستی وسۆز، تارماییەکی قورس دایدەپۆشی. ئەم ووشکیەش لەگەڵ سروشتی ژیانی هاوسەرێتیدا ناگونجێ ئەمجا درەنگ بێ یان زوو دەبێتە هۆی دانانی سنوورێك بۆ پەیوەندیە هاوسەریەکان وبە هەر شێوەیەك بێت کۆتایی پێ دێنێ .

دەیەم: هەندێك جاریش توندو تۆڵی سۆزە خێزانیەکان و کڵپەکردنی هەڵچوونی پەیوەست بەو سۆزانە و دڵپەیوەندبوون و بابەتی لەو شێوەیە، دەبنە هۆکاری ڕاستەوخۆ لەپەیدابوونی (گرژی) و زیادبوونی توندوتیژی، چونکە وردی لەحەق و حساب کردن لەگەڵ پیاودا لەناو خێزان و لەدەرەوەیدا، وە زۆریش دڵپێوەبوونی لەتێکەڵاوی و هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکیدا و

بەدواداچوون و جووڵەو کپی و لێکدانەوەی تایبەتی بۆ ناڕاستەکان...هەموو ئەو کارانە، زیان بە پەیوەندی هاوسەری دەگەیەنن و وادەکات کە هەریەك لەو دوو هاوسەرە هەراسان بێ بەوی دیکەو یەکتری تاوانبار بکەن بەوەی کەبەرامبەرەکەی بێتاوان نییەو بێ وەفایە، بۆیە دڵپێوەبوون و خۆشەویستی لەڕادەبەدەر , کۆمەڵێك گومان و بیری خراپ کەبوونیان نییە دەوروژێنێ، ئەو جۆرە گومانانەش ڕوونی پەیوەندییەکانی هاوسەرێتی دەشڵەقێنێ و لێڵی دەکات.

یانزەیەم: خۆهەڵقورتاندنی خزمان لەپەیوەندییە هاوسەرییەکان، یان جۆرێك بەژداریکردنیان لە ژیانی خێزاندا. ئەمەش بەهۆی ئەزموون و ئامارگیری زۆرەوە دەرکەوتووە کە هۆکارێکە شوێنەواری زۆری هەیە لە زیادکردنی بارگرژی خێزاندا...ڕەنگە کێشەی نێوان بووك و خەسوو لەناو چەند خێزانێکدا بچێتە ناو ئەم جۆرە هۆکارەوە، ئەگەرچی کێشێکی ئەوتۆی نیە.

دوانزەیەم: هاوڕێ و دراوسێ، ڕەنگە ئەمانە ڕۆڵی ترسناك ببینن لە ڕەوتی ژیانی خێزاندا وە خۆهەڵقورتاندنیان لە پەیوەندییە خێزانیەکان ببێتە هۆی پەیدابوونی (بارگرژی) و زیادبوونی توندو تیژیەکەی. زۆر گوێمان لێدەبێت کە زیادەڕۆیی و بێ پەردەیی لە پەیوەندییە بەرامبەرییەکان لەنێوان هاوڕێ و دراوسێیەکاندا یان لەنێو خزماندا، وە خۆهەڵقورتاندنیان لە کارو باری یەکتری، چۆن بووەتە هۆی ئەنجامی ئەوتۆ کە پاشەڕۆژی دڵنیاکەرەوە نییە. ئامارەکانیش ئاماژە بەوە دەکەن کە زۆربەیان بە لێکترازانی خێزان و هەرەسهێنانی کۆتایی دێت زۆر بەخێرایی.

سێزدەم: نەبوونی، یان کەمی هۆکارو ئامرازی حەسانەوە و کات بەسەر بردن و وشکی مامەڵەکردنی ئەندامانی خێزان لەگەڵ یەکتری، ئەمانە دەبنە هۆی هەناسەتەنگی و چەند قەیرانێك، ئەمجا دەبنە هۆی بارگرژی لەناو خێزاندا.

چواردەم: نەبوونی چەند خەسڵەتێك، وەك: وەفا و وەدڵسۆزی و ڕوونی ڕاشکاوی و ڕاستگۆیی لەهەڵسوکەوتکردنی هاوسەران لەگەڵ یەکتری...ئەمەش ڕەنگە مەبەستدار یان بێ مەبەست ڕووبدات، لەئەنجامی نەزانی و پەی پێنەبردن و نەبوونی بەرچاو ڕوونی بۆیە بارودۆخێك دەبێتە هۆی ئاشکرابوون و دەرکەوتنی ڕاستگۆیی و ئاشکرابوونی نیازخراپی و مەبەست خراپی، هەروەها نەبوونی وەفا و دڵسۆزی، لەکاروباری خێزاندا ڕوون دەبێتەوە، جا چ لەلایەن مێرد یان ژن یان منداڵەکانەوە بێ، ئیتر ڕەنگە پێوستی بەڕوونکردنەوە نەبێ کە ئەم جۆرە بابەتانە چۆن دەبێتە هۆی دڵتەنگی و تۆوی دووبەرەکیو دووڕوویی لەناو پەیوندییە خێزانییەکاندا دەچێنێ.

ئەمانە چەند هۆکارێکی بارگرژین لەچوارچێوەی خێزاندا...جا هەندێك جار سادەو سنووردارن و بەماوەیەکی کەم چارەسەر دەکرێن. بەڵام بۆی هەیە جارێکی دیکەش پەیدابنەوە و وەك جەنگی سارد لەنێوان ژن و مێردا بەردەوام دەبن...بەڵام ئەگەر کێشەکان زۆر بەردەوام و دووبارەبوونەوە، ئیتر لە کۆتاییدا ڕەنگە ئەو ناکۆکیانە لەڕێگەی دەستلێکبەرداربوون و جیابوونەوە وکۆتایی بەو پەیوەندییە و دەزگا گرنگە بهێنرێ. ڕەنگە ئەم جیابوونەوەیەش هەر ئاسان نەبێت و یەکێکیان نەچێتە ژێر باری داواکاری ئەوی دیکە و بەردەوام بن لە ناکۆکی و ململانێ لە دادگا بۆماوەیەکی دوورودرێژ .

بەرێز دکتۆر عمر پەتی پسپۆری پەروەردە ئەم هۆکارانەی خستەڕوو:

هۆکارەکانی شکستهێنانی ژیانی هاوسەرگیری:

ژیانی هاوسەرگیری نێوان دوو تاك، ژیانێکی سادە و ئاسان نیە، بەڵکو پێکەوە ژیانی دوو مرۆڤە کە هەریەکێکیان لە ژینگەیەکی جیاوازەوە هاتووە و گەورەبووە، بۆیە لەوانەیە ئەم ژیانە تووشی گیروگرفت و تەنگە چەڵەمەیان بکات. ئەم خاڵانەی خوارەوە کۆمەڵە هۆکارێکن بۆ خراپ بوون و تێکدانی پەیوەندی هاوسەرگیری نێوان ژن و مێرد:

١. ناکۆکی و شەڕە دەنگی ڕۆژانە کە لەوانەیە سروشتی یەکێك لە ژن و مێردەکە بێت.

٢. پشت گوێ خستنی یەکێکیان لەلایەن ئەوی ترەوە، بە مەبەست بێت یان بێ مەبەست.

٣. خراپ بەڕێوەبردنی پەیوەندی نێوان (ژن ومێرد) یان بەڕێوەبردنی بەشێوەیەکی لاسەنگ وەك ئارەزووی زۆری یەکێکیان بۆ ئەوی دیکە، یان دوور کەوتنەوەی زۆر و بێ پاساوی یەکێکیان بۆ ئەوی دیکەیان.

٤. سەربەخۆ بوونی یەکێکیان لە داهاتدا، واتە یەکێکیان وەك سەربەخۆ بۆ خۆی بژی، ئەگەرچی هەردووکیان لە ژوورێکدا پێکەوە بژین.

٥. بردنە دەرەوەی نهێنی ماڵ بۆ کەسوکار و هاوڕێیان ئەگەرچی بۆ ئامۆژگاری و پەند وەرگرتنیش بێت.

٦. بەشدارپێکردنی لایەنی سێیەم لە گیروگرفت و کێشەکانی نێوان خۆیان (ژن ومێرد).

٧. نەمانی خۆشەویستی یان نەزانینی چۆنیەتی دەربڕینی ئەو خۆشەویستیە بۆ یەکتر لە ڕێگەی جۆراوجۆرەوە.

٨. بە ئەنقەست پشت گوێ خستنی بۆنە گرنگەکان، کە بۆ هەردووکیان جێی گرنگی بێت (ڕۆژی لەدایک بوون، ڕۆژی هاوسەر گیری...هتد).

٩. ڕێز نەگرتنی لە یەکتر و بە سووک سەیرکردنی تواناکانی یەکتر.

١٠. سەرزەنشتی زۆر و دەرخستنی کەم وکوڕی بەشێوەیەکی بەردەوام و هەمیشە باسکردنی لایەنە خراپەکانی یەکێکیان لەلایەن ئەوی دیکەیانەوە.

١١. زۆر کردن لە مێرد لەلایەن ژنەوە بۆ ئەوەی کە زیاد لەتوانای ماددی خۆی ئەرك بدات بەسەریدا.

١٢. شوێنکەوتنی ئارەزوو و خیانەتی هاوسەرگیری کە مێردەکە ئەنجامی بدات.

١٣. هەڕەشەی تەلاق، کە زۆربەی جار مێرد وەك شمشێرێك لەسەر ملی ژنەکەی دایدەنێت. یان بەردەوام داواکردن لە ژن بۆ ئەوەی بڕواتەوە بۆ ماڵی باوکی. ئەم هەڕەشانە زۆر بەخێرایی ژیانی هاوسەرگیری کۆتایی پێ دەهێنێت و تێکی دەدات.

## باسی دووەم: پۆلێن کردنی هۆکارەکانی کێشەکانی ژیانی هاوسەرگیری لەلایەن زانایانی کۆمەلناس و ئابووری و دەروونناسەوە

هیچ خێزانێك نیە کێشەی تێدا نەبێت، زۆر جار ئەو کێشانە بچووکن و سوودی هەیەو دەبێت هۆکارێك بۆ شکانی هەندێ ڕۆتینیات و زیاتر لێك تێگەیشتن، بەلام بەردەوامی کێشەو گەورەبوونی دەبێتە هۆی شێوانی ژیانی خێزان، ئەو کێشانەش لە گشت وولاتانی جیهان باوەو لە هەموو ئاستەکانی کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری و لە هەموو کات وساتێکدا، خۆیان لەم هۆکارانەی خوارەوە دەبیننەوە:

یەکەم : هۆکارە ماددیەکان.

بارودۆخی گرانی ژیان و زۆربوونی پێداویستیەکانی خێزان و مندالْ هەردوو هاوسەر هەولْ دەدەن بۆ دەستەبەرکردن و دلنیابوونی ژیانی هاوبەش، ئەم هەولْدان وماندوبوونەش زۆرجار دەبێتە هۆکارێك بۆ کێشە دروستبوون. ئەو جۆرە کێشانەش بە ئاسانی چارەسەر ناکرێن ئەگەر هەردوولا پێکەوە گفتوگۆ نەکەن تاوەکو بە جوانی لە بارودۆخی یەکتری تێبگەن و ، باوەڕ پێکردنی هەر یەکیان بە هەول و ماندوبوونی ئەوی تر بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانی خێزان و گوزەرانی باشتر بۆ مندالەکانیان. بۆیە پێویستە هەردوو هاوسەر بە گوێرەی توانای دارایی خۆیان خەرجیی بکەن و خۆیان بگونجێنن لەگەلْ بارودۆخی ماددی خۆیان، وەیان هەولْ بدەن بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی تری دارایی.

دووەم: الغیرة:

هەلگرتنی غیرە و دلپیسی یەکیان بەرامبەر ئەوی تریان یان هەردووکیان بەرامبەر بە یەکتری، ئەوەش سروشتی ئادەمیزادەو زۆر بەئاسانی ناتوانرێ بگوڕدرێ، بەلام دەتوانرێ خۆیان لەو کێشەیە دەرباز بکەن بە موراعات و ڕێزگرتن لە هەست و نەست و خواستی یەکتری وزیاتر لێك تێگەیشتن و ڕوونکردنەوەی هۆکارەکانی.

سێیەم: جیاوازی زۆر لە نێوانیان و پێکەوە نەگونجان:

زۆرجار دەبینین جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان هەردوو هاوسەر لە ئامانج و خواست و جۆری خواردن و داب ونەریت و هەندێ هەلسوکەوتی ڕۆژانە ئەمانەش دەبنە هۆی کەوتنەوەی

کێشە. چارسەری ئەوەش دەگرێت بەوەی ڕێز لە ئامانج و هیوایەتی یەکتری بگرن و گاڵتە بە یەکتری نەکەن کاتی بوونی جیاوازی لە هەندێك هەڵسوکەوت، چونکە هەریەکیان لەوانەیە لە شوێنێکی جیاوازو ناو ژینگەیەکی جیاواز گەورە بووبێت ئاوا بە ئاسانی ناتوانرێ لەسەر یەك کۆپی بکرێن لە سیفات و هەڵسوکەوتدا، وە دەتوانرێ یەکیان بۆ ئەوی تر تەنازول بکات، وەیان گونجان وسازان لە نێوانیان دروست بکرێت.

چوارەم: ناکۆکی لەسەر کارو شتە سەرەکیەکان :

پێکەوە ژیان واتە پێکانی ئامانجەکان بە یەکەوە، بەڵام زۆرجاران دەبینین لە ئامانجە سەرەکیەکاندا هەردوو هاوسەر ناگەنە یەکتری و هاو ڕاو هاو بیر نین وەك کڕینی خانوو، شوێنی خانوو، وەیان یەکیان ئامانجی دروستکردنی خانووە بەڵام ئەوی تریان ئامانجی لە پارە کۆکردنەوە کڕینی سیارەیە، ئەوا لێرە کێشە دروست دەبێت، بۆ چارەسەری ئەم جۆرە کێشانە ئەوا پێویستە هەردووکیان بە جدی لێکۆڵینەوە بکەن لەو بابەتەو بیخە بەرچاوی خۆیان لە ئێستاو داهاتوودا کام ئامانج و بەرنامە بۆ خۆیان ومنداڵەکانیان سوودی زیاترەو لە بەرژەوەندیاندایە.

پێنجەم: ماندوبوون وفشاری دەروونی:

ماندوو بوون و فشاری دەروونی لە سەر هەریەك لە دایك وباوك بەهۆی کاری ڕۆژانەی دەرەوەو ناوەی ماڵ و چاودێری و پەروەردەی منداڵ زۆرجار دەبنە کێشە لەناو خێزان. چارەسەری ئەو بابەتەش ئەوەیە کاری دەرەوەو ماڵەوە جیابکرێتەوەو هاوکاری یەکتری بکەن و هەریەکیان تەقدیرو ڕێزی ماندوبوونی ئەوی تر بگرێت.

شەشەم: بەسەربردنی زۆربەی کات لە دەرەوەی ماڵ:

بەسەربردنی کاتێکی زۆر لە دەرەوەی ماڵەوە لەلایەن یەکێك لە ئەندامانی خێزان یەکێکە لە کێشە سەرەکیەکانی نێوان هەردوو هاوسەر، هەرچەندە هەر یەکێك لە تاکەکانی خێزان تایبەتمەندی خۆی هەیە لە ژیان، بەڵام پێویستە گرنگیش بدرێت بە پێکەوە ژیان و هەستی لایەنی تر. چارەسەری ئەوەش دەگرێت بە دروستکردنی هاوسەنگی لە نێوان کاری تایبەت و چوونە دەرەوەو لە نێوان ژیانی هاوبەشی ناو خێزان کە بە ڕەزامەندی هەردوو لا بێت.

کێشەکانی خێزان زۆرن و هەر بەردەوامیش دەبێت تاوەکو ژیان لە سەر زەوی بەردەوام بێت، بەڵام دەبینین هەندێك خێزان ژیانی هێمن و ئاسوودە ترە لە وانی تر.

# دەتوانرێ کێشەکان بۆ سێ تەوەر دابەش بکرێن

تەوەری یەکەم: لە ڕوانگەی پیاوەکەوە:

١- ئافرەتەکە تەقدیرو ڕێزی ماندوبوون و کاری هاوسەرەکەی ناگرێت لە دەرەوەی ماڵ .

٢- ئافرەتەکە موراعاتی باری دارایی و ئابووری هاوسەرەکەی ناکات.

٣- جیاوازی لە ئارەزووی ئافرەت و پیاو لە ژمارەیەك لە بوارەکانی ژیان وەك خواردن ، جل وبەرگ، ئامانجەکانی تر.

٤- ئافرەت کاروباری خێزان و منداڵەکان پشتگوێ بخات.

تەوەری دووەم: لە ڕوانگەی ئافرەتەکەوە:

١- ناکۆکی نێوان ئافرەت و دایکی پیاوەکەی (خەسووی).

٢- دەستێوەردانی پیاو لە کاری ماڵەوە زیاد لە پێویست.

٣- بەسەربردنی کاتێکی زۆر لەلایەن پیاوەوە لە دەرەوەی ماڵ.

٤- جوێنی ناشرین بە ئافرەت بدات لە بەرامبەر منداڵەکان.

٥- نزمی ئاستی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی پیاو بە بەراورد لەگەڵ ئافرەتەکە.

٦- ئافرەتەکە نەتوانێ هاوسەنگی دروست بکات لە نێوان کاری دەرەوەی ماڵ پێداویستیەکانی ناو ماڵ.

تەوەری سێیەم: هۆکارە هاوبەشەکان

١- زاڵبوونی سۆزو بەرژەوەندی کاتی هەڵبژاردنی هاوسەر لەلایەن هەردوو لاوە.

٢- نەگونجان و لێك تێنەگەیشتن بە هۆی دووری تەبیعەت و بیرو باوەڕ.

٣- دووری وجیاوازی لە ئوسلوب و جۆری پەروەردەکردن لە نێوان دایك و باوك؟

٤- کێشەی ئابووری.

٥- درۆکردن لە گەڵ یەکتری.

٦- دەست تێوەردانی کەس وکاری هەردوو لا لە ژیانی ڕۆژانەی خێزان لە سەر گشت بابەتە بچوك و گەورەکان.

٧- غیرە کردن بەرامبەر بە یەك.

٨- جیاوازی تەمەن.

٩- حەسوودی و ئەنانیەت (ئێرەیی وخۆویستن).
١٠- نەبوونی گفتوگۆی بەردەوام لە نێوانیاندا.
١١- ئارەزووکردنی هەبوونی منداڵی زۆر.
١٢- هەست نەکردن بە لێپرسراویەتی.
١٣- لێك تێ نەگەیشتنی یەکتری.
١٤- بردنە دەرەوەی نهێنیەکانی ناو ماڵ.
١٥- خەرج کردنی پارە بە خۆڕایی.
١٦- خۆ سەپاندن و ماڵ سالاری.
١٧- ناپاکی کردن بەرامبەر بە یەکتری.

هەروەك باسمان کرد ئەو کێشانە دروست دەبن، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو لایەنە بەرپرسە دیاری بکەین بۆ چارەسەری ئەو کێشانە، ئایا دادگاو قازیە، یان ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیە، یان لایەنە حیزبیەکانن و یان مامۆستاو مزگەوتەکانن یان سەرۆك عەشیرەت و پیاوە ماقولەکانن. لە ئێستادا دەبینین جۆری کێشەکانیش جیاوازن لەگەڵ ساڵانی ڕابووردوو لەبەر گۆڕانی باری سیاسی و ئابووری و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لە عێراقدا. بۆیە پێویستە زۆر بە وردی دراسەو لێکۆلینەوە بکرێت لە سەر ووردەکاری کێشەکەو دیاریکردنی ئەو لایەنەی توانای هەیە کە کێشەکە چارەسەرو بنبڕ بکات، نەوەك بەرەو ئاقارێکی تری حیزبی و سیاسی ببات و هەندەی تر کێشەکەو برینەکان قووڵتر بکرێتەوەو جیابوونەوەو کوشتن و ماڵ کاولکردن و سەرگەردانی منداڵەکانی بەدوادا بێت.

## باسی سێیەم: باسکردنی سێ کێشە بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە

١- دووری وجیاوازی لە ئوسلوب و جۆری پەروەردەکردن لە نێوان دایك و باوك؟

لە زۆربەی خێزانەکاندا دووری و جیاوازی هەیە لە نێوان چۆنیەتی پەروەردەکردنی منداڵەکان، وە هەروەها چۆنیەتی سزا دانیان کاتێ هەڵدەستن بە کارێکی نا دروست، بۆ نموونە باوك بەتوندی سزای منداڵەکە دەدات، بەڵام دایك دەڵێ: ئەو کارەی ئەو منداڵە ئەنجامی داوە کارێکی سروشتیەو منداڵان زۆربەی ئەو جۆرە کارانە ئەنجام دەدەن بۆیە پاکانەی بۆ دەدۆزێتەوە، لەمەدا هەردوکیان نەیانتوانیە بە شێوەیەکی دروست منداڵەکە پەروەردە بکەن. ئا لەو جۆرە جیاوازی پەروەردەیی یە کێشە دروست دەبێت لە نێوانیان و منداڵەکانیش سەرگەردان دەبن. دروستیەکەی ئەوەیە : کاتێ منداڵ کارێکی باشی ئەنجامدا ئەوا پاداشتێکی بچووك و گونجاو بکرێت و هانی ئەوەی بدەی بەردەوام بێت، وە ئەگەر هەڵەیەکی کرد ئەوە سزایەکی وای بدرێت کەوا سوودی بۆی هەبێت و نەگەڕێتەوە سەر ئەو کارە جارێکی تر.

٢- ناکۆکی نێوان ئافرەت و دایکی پیاوەکەی (خەسووی):

ئەو کێشەیە زۆر ڕوودەدات لەو کاتەی دایك و باوك لەگەڵ کوڕەکەی و هاوسەرەکەی لە یەك ماڵدا دەژین، چونکە دایك زۆر چاوی لەسەر کوڕەکەیەو هەر حیسابی جارانی بۆ دەکات کەوا منداڵ بووەو بەردەوام بە دوای هەنگاوەکانیەتی، کە دەچن بۆ شوێنان ئەویش لەگەڵیاندا دەڕوات (بۆ بازار، سەردان، سەیران) ئەمەش وا دەکات هاوسەرەکەی دڵگران بێت، وای بۆ دەچێت کەوا ئەوە پێشێلی مافەکانیەتی و ئازادی لێزەوت کردنە و دەست وەردانە لە کاروباری ژیانی ئەو وەك تاك و وەك خێزان. ئەو دوو هەڵسوکەوتە جیاوازە هەردوکیان هەڵەیە، چونکە ڕۆڵی دایك لە پەروەردەو سەرزەنشت کردن تەواو دەبێت پاش ئەوەی کوڕەکەی پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجامدا، وە ئێستا ژیانی تایبەتی هەیەو لێپرسراویەتی هەیە بەسەر هاوسەری و منداڵەکانی و دایك وەصی و چاودێر نیە بەسەریەوە، هەروەك چۆن ئەو کاتی خۆی شووی کردو بووە خاوەنی ماڵی خۆی و باوکی لێپرسراویەتی لێ سەندراوە بە هەمان شێوەش ئەو ڕۆلی لە بەڕێوەبردنی ماڵی کوڕەکەی نەماوە، تەنها لەسەر منداڵەکان پێویستە کەوا ڕێزی بگرن و بە جوانترین شێوە ڕەفتاری لەگەڵدا بکەن، وە پێویستە ئافرەتەکەش هەست بەوە بکات کەوا ئەو دایکە بە دوور کەوتنەوەی کوڕەکەی و هاوسەرگیری بۆشاییەك لە ژیانیدا دروست بووەو ماوەیەکی دەوێت تاوەکو لەگەڵ ئەو ژیانە

نوێیە ڕابێت، وە نا بێت ئافرەتەکە ئەوەندە خۆپەرست بێت و پیاوەکە لە ماڵی باوکی و سۆزی دایکی دابڕێت، بەڵکو پێویستە ڕێزیان بگرێت و خزمەتیان بکات و چاوپۆشی بکات لە هەندێ قسەو کار کە دەیکات وەك گەورەیەك و دایکی خۆی سەیری بکات و هانی پیاوەکەی بدات کەوا چاودێری دایك و باوکی بکات و خزمەتیان بکات، تاوەکو لەلایەن دایکەکەوە ئەو هەستە دروست ببێت کەوا خێزانی کوڕەکەی وەك کچی خۆی وایە لە خزمەت وڕێزگرتنیدا. وە هاوسەریش ئەوە لە بیر نەکات کەوا خۆشی وئاسوودەیی دایکی مێردەکەی ڕەنگدەداتەوە لەناو خێزان و لەکاتی بەسەر چوونی تەمەنیدا بەهەمان شێوە خۆشی بەو بارەدا تێپەڕ دەبێت.

٣- ململانێ لە نێوان هەردوو هاوسەردا:

عینادی کردنی هاوسەرەکان و دانەبەزین لەسەر قسەو بیرو فیکری خۆی و ئەوەی لە مێشکیدایە هەر ئەو بە ڕاست بزانێ و نەتوانێ وشەیەکی خۆش و نەرم ونیان بەکار بهێنێت، ئەوا کێشە دروست دەکات هەرچەندە لە ڕووەکانی ترەوە ئەو خێزانە گونجاو بن. پێویستە لەو کاتانەدا هەر یەکیان ئەگەر لەسەر هەڵەبوو ئەوا دان بە هەڵەکەی خۆی بنێ و بە تنازل دانەنێ، وا نەزانێ ئەو دابەزین و دان پێنانە لە کەسایەتی و کەرامەتی دەهێنێتە خوارەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەرزی و فەزیلەتە (الاعتراف بالخطأ فضيلة)، جا ئەو دان پێنانە چ لەلایەن ئافرەتەکەوە بێت یان لەلایەن پیاوەکەوە بێت. وە دەتوانن بۆ چارەسەری ئەو جۆرە کێشانە دانیشتنێکی هێمنانەوەو گفتوگۆیەکی لەسەر خۆ بکەن و بیرو ڕای خۆیان بگۆڕنەوەو لە یەکتری تێکبگەن بەمەش دەگەنە چارەسەری کێشەکان و لە ئەنجامدا بۆیان ڕوون دەبێتەوە کەوا وەرگرتنی بیروڕای یەکتری زیاتر لە واقعیان نزیك دەکاتەوەو دڵیان زیاتر ئاسوودە و ئارام دەبێتەوە بەرامبەر بە یەکتری و خێزان دەکەوێتە ناو کوشێکی پڕ لە خۆشەویستی و نەرم و نیانی وگەشە سەندن.

پێویستە هەردوو ڕەگەز نێرو مێ بزانن کەوا پاراستنی ئاسوودەیی و نەهێشتنی هەڵوەشاندنەوەی خێزان خاڵێکی زۆر گرنگە لە ژیانی کۆمەڵگەو کیانی نیشتیمان، چونکە کۆمەڵ و نیشتیمان یەکەی سەرەکییان بریتیە لە خێزان، بە توندو تۆڵی خێزان کۆمەڵگە دوور دەکەوێتەوە لە تاوان و بەدڕەوشتی و پشێوی دەروونی و نا هاوسەنگی و هەڵوەشاندنەوە. هەروەك شاعیر دەڵێ:

| | |
|---|---|
| نەتەوە بریتیە لە خورەوشت | ئەگەر خورەوشتی نەما ئەوا خۆشی نامینێ |
| إنمـــا الأمم أخلاق ما بقيت | فــــإن ذهبت أخلاقهــــــم ذهبــوا |

بۆیە زۆر پێویستە لەسەر هاوسەرەکان خەمی کۆمەڵگەو نەتەوەی خۆیان بێت و لەبەر بەرژەوەندی خۆیان و سووربوون لەسەر ڕای خۆی نەبێتە هۆی تێکدانی کۆمەڵگەو سەرگەردانی نەوەکانی دوارۆژی گەل ومیللەت.

## باسی چوارەم: هاوسەرگیری ئەلیکترۆنی و لایەنی نێگەتیڤەکانی ئەو جۆرە هاوسەرگیرییە

بەڕێز د. عمر پەتی لەسەر ئەم بابەتەوە دەڵێ:

- لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئینتەرنێت لەناو توێژی لاواندا، یەکتر ناسین و حەز لەیەکتر کردن و هاوسەرگیری ئەلکترۆنی پەیدا بووە و دایکان و باوکان ڕۆڵیان لەم پرۆسەیەدا کەم بۆتەوە.
- بە پێی ئامارێك لە هیندستان لە ساڵی ٢٠٠٦ دا زیاتر لە ملیۆنێك کوڕ و کچ لە ڕێگەی ئینتەرنێت و دوور لە دایك و باك و کەسوکار ئاهەنگی هاوسەرگیریان ئەنجامداوە. ئەم ڕێژەیە لە بەرزبوونەوەدایە و مەزندە دەکرێت ساڵانە بەڕێژەی ٢٠% لە هیندستان زیاد ببێت. لە وڵاتی چینیش ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە سەری هەڵداوە. لە ئیسپانیاش زیاتر لە ٤٠٠ هەزار کوڕ و کچ لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە بەیەك گەیشتوون.
- شارەزایەکی ئەم بوارە پێی وایە ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە نیشانەی نەمانی جیاوازی و کەلەبەری چینایەتی و زمان و نەتەوە و داب و نەریتە کە لەڕابردوودا ڕێگربوون لەبەردەم ئەم پرۆسەیەدا.
- ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە سەرکەوتووە ئەگەر هەردوولا بەشێوەیەکی ڕاستەقینە و بێ زیادەڕۆیی باسی یەکتری بکەن.

هەنگاوەکانی ئەم هاوسەرگیرییە:

- یەکترناسین لە ڕێگەی تۆڕی ئینتەرنێتەوە.
- پاشان کوڕەکە داوا لە کچەکە دەکات شووی پێ بکات. ئەگەر کچەکە ڕازی بوو پەیوەندییەکە بەهێزتر دەبێت و لە ڕێگەی ئەو ئاژانسانەوە بەیەك دەگەن.

لایەنە خراپەکانی ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە:

- ئەگەر کوڕ و کچەکە لە دوو وڵاتی جیاواز بن ئەوا هەستی نەتەوەیی و نیشتمانیان لاواز دەبێت.
- ئەو جۆرە کەسانە پەیوەندییان بەکەسوکارەوە نامێنێت و لە خەیاڵی و دڵەڕاوکێدا دەژین.
- ئەو جۆرە کەسانە دوای ئەوەی دەگەڕێنەوە بۆ واقعی کۆمەڵگا تووشی دڵشکاوی و خەمۆکی دەبن.

## باسی پێنجەم: هەندێك لە ئوسلوبی كرداری بۆ چارەسەری كێشەی هاوسەرگیری

یەكەم هۆكار بۆ خۆشبەختی خێزان بریتیە لە گوێڕایەڵی كردن بۆ خوای پەروەردگارو فەرمانەكانی جا بە كردن و ئەنجامدان بێت یان بە نەكردن و دووركەوتنەوە بێت، بە پێچەوانەوە ئەنجامدانی تاوان و گوناه و دووركەوتنەوە لە بەرنامەی خوا هۆكارە بۆ سەرهەڵدان و گەشە سەندنی كێشەو ناكۆكی لە ناو خێزان. زۆر جاران كێشەكانی ناو خێزان خێرو چاكەی پێوە بەندە ئەگەر بتوانین عیبرەت و پەندو ئامۆژگاری لێوەر بگرین، وە نابێت هەموو كات تەنها لایەنە سلبی و خراپەكانی وەربگرین بەڵكو لەوانەیە لە داهاتوودا خێری زۆری پێوە بێت چونكە نابێت هەموو شتێك تەنها بە ڕووكەش وەربگرین بەڵكو مامەڵە كردن لەگەڵی بە شێنەیی و هێمنی وقووڵی تاوەكو سوودی لێوەربگرێن. هەروەك چیرۆكی حەزرەتی موسی و پیاوە چاكەكە كە لە ڕووكەشەوە هەمووی كاری نا دروستە، بەڵام لە ڕووەكەی ترەوە پڕی بوو لە حیكمەت و كاری سەرسووڕهێنەر. هۆكاری كێشەكانی ناو خێزان هەیانە هۆكاری ئاین و كۆمەڵایەتی و ئابووری و نەفسی و كەسێتی یە.

پێویستە لەسەر هەردوولا بە چاوێكی واقیعی یانە تەماشای ناكۆكی و كێشەكانی هاوسەرگیری بكەن، زۆری ئەو كێشانەن وا دەكەن هەردوولا دەست بكەن بە گفتوگۆو بیروڕا گۆڕینەوەو گەیشتن بە ژیانێكی ئاسوودە.

خاڵی گرنگ بۆ پیادە کردن:

١- بێ گومان وشەی توند ودەستەواژەی بریندارکەر دەنگدانەوەی خۆی هەیە، لە دوای چارەسەری كێشەكەش بەتایبەتی ئەوانەی بەركەوتەی ڕاستەوخۆی هەیە بە پەیوەندیە عاتفی و سۆزدارەكان كە لەناو ناخی مرۆڤدا زۆر دەمێنێتەوە، بۆیە دوور كەوتنەوە لەو وشەو دەستەواژانە زۆر پێویستە.

٢- خۆ بێ دەنگ كردن و وەڵام نەدانەوە هۆكارێكە بۆ چارەسەری كێشەكە بە شێوەیەكی كاتی، بەڵام ئەگەری سەر هەڵدانەوەی هەیە لە داهاتوودا، چونكە لەناو سینەو مێشكدا شوێنەواری هەرماوە. چارەسەری ئەوە كە لە بیر بكرێت بە یەكجاری بەسەریدا نەچنەوە، یان دانیشتنی بۆ بكرێت بە دڵێكی پاك و دەرونێكی ئاسوودە تا چارەسەری بۆ دەدۆزنەوە.

٣- دووركەوتنەوە لە هەموو ئەو ئوسلوبانەی كە دەبێتە هۆی سەركەوتنی لایەك بەسەر لایەكەی تردا، چونكە ئەمە كێشەكە قووڵتر دەكات و ڕەگ وڕیشەی زیاتر دادەكوتێ. وەك ئوسلوبی

گاڵتە پێکردن و بە کەمزانین، یان ئینکارو بەرپەرچدانەوە. لە عەبدوڵڵا کوڕی عمرو دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ وشەی ناشایستەی بەکار نەهێناوە بەرامبەر بە کەس و دەیفەرموو: باشترینتان خاوەن جوانترین ڕەوشتە. بوخاری گێڕاویەتیەوە.

هەروەها عائشە دایکی موسلمانان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕنەوە : شوێنی خراپترین کەس لە ڕۆژی دوایی شوێنی ئەو کەسەیە کەوا خەڵکان لێی دوور بکەونەوە تاوەکو لە خراپەکانی خۆیان بپارێزن.

ئەنەسی کوڕی مالك دەڵێ: زیاتر لە ٢٠ساڵ لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم ڕۆژێك پێی نەوتم بۆچی وات کرد یان بۆچی وات نەکرد، یان بۆچی ئەو کارەت جێ هێشت یان کردت.

٤- تێگەیشتن لە بنەوان وسەرچاوەی کێشەکە و کاریگەری لەسەر هەردوولا؛ چونکە بێ گومان ناکۆکی نێوان دوو خۆشەویست وهاوسەر کارێکی قورسە و زۆر گرنگی دەروونی و ناهاوسەنگی دروست دەکات، بۆیە پێویست دەکات لێی تێبگەیت.

٥- دوور کەوتنەوە لە خۆ بەگەورەو زل زانین بە هۆی پارەو ڕەگەزو جوانی و ئاستی خوێندەواری وهۆزو خوێش. ئەمەش هۆکارێکی سەرەکی کێشەکانە.

٦- نا بێت بە پەلە بڕیاری کۆتایی بدەیت و وشەی بەڵێ یان نەخێر بەکار مەهێنە تاوەکو کێشەکە بە جوانی تاوتوی نەکەی و هەڵسەنگاندنی بو نەکرێت.

## هەنگاوی پێویستن:

١- پێویستە هەر یەك لە هاوسەرەكان بە شێوەیەكی ڕوون ئەوەی لە دڵیەتی باسی بكات و بەنیازی خۆی بەجوانی و ڕاستەوخۆ باس بكات، ئەوە هۆكارە بۆ لابردنی گومانی لێك تێنەگەیشتن وئەو كات كێشە ڕوونادات، چونكە خۆی لە خۆیدا كێشە نەبووە بەڵكو لێك تێنەگەیشتن بووە.

٢- گەڕانەوە بۆ لای نەفس و ئارەزوو و موحاسەبە كردنی لەسەر ئەو كەم و كوڕیانەی كە هەیەتی بەرامبەر بە خولقێنەرو پەروەردگار، ئەمەش وا دەكات زۆر بە ئاسانی لە هەڵەی هاوسەرەكەت ببووری و ئەوەش باشترین و گەورەترین عیبادەتە.

٣- زانینی ئەو ڕاستیەیە كە هەر بەڵاو موسیبەتێك تووشی مرۆڤ دێت بە هۆی گوناهەكانیەوەتی، گەورەترین موسیبەتیش ئەوەیە بكەویە ناو ناخۆشی و ناكۆكی لەگەڵ ئەو كەسەی كە خۆشت دەوێت ئەویش هاوسەرەكەتە. هەروەك محمدی كوڕی سیرین دەڵێ: من گوناهی خۆم دەزانم لە خولقی هاوسەرەكەم و هەڵسوكەوتی ولاخەكەم.

٤- نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی دەنگۆی ناكۆكیەكان بۆ دەرەوەی چوارچێوەی دۆست و خزمە زۆر نزیك و دڵسۆزەكان.

٥- دیاریكردن و دەست نیشانكردنی بنەڕەتی ناكۆكیەكەو چڕكردنی هەوڵەكان بۆ چارەسەری و نەگەڕانەوە بۆ ناكۆكیەكانی كۆنی بەسەرچووەكان یان ناكۆكیە سادەكان و هەڵدانەوەی لاپەڕە كۆنەكان.

٦- تا بێت هەر یەكێك باسی كێشەكە بكات بە گوێرەی تێگەیشتنی خۆی و ڕای خۆی بە دروست بزانێ كە گومانی تیا نیەو پێویست بەوە ناكات دانیشتن و گفتوگۆی بۆ بكرێت، ئەو جۆرە بیركردنەوانە وا دەكات چارەسەر زۆر ئەستەم بێت و هەر لە لانكەوە بڕیاری خنكانی بۆ دەركراوە.

٧- لە سەرەتای كێشەكە دەبێت خاڵە باش و چاكەكانی هەریەكیان باس بكرێت و ئەوانی تر بەلاوە بنرێ تاوەكو دڵ ئارام و ئاسوودە بێتەوە و شەیتان دوور بكەوێتەوەو نەفس و ئارەزووش هەندێك دابەزێ وتەنازول بكات، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ (ولا تنسوا الفضل بینكم). هەروەك ئەوەیە یەكیان بڵێت لە سەرەتای قسەكانی من فەزل و چاكەی تۆ لە بیر ناكەم لە و شتانە وەك ........، وە تۆش زۆر خاڵی ئیجابیت تیایە و خاڵە هاوبەشەكانیشمان زیاترە لە خاڵە

ناکۆکیەکان ، ئەم قسانە وا دەکات لایەنی بەرامبەر تووڕەییەکەی دابمرکێتەوە و ناکۆکیەکە بە ئاسانی چارەسەر بکرێت.

٨- نا بێت تەنها چاوت لەسەر مافەکانی خۆت بێت و گەورەی بکەیت و داکۆکی لەسەر بکەیت و نەچیت بەلای ئەرکەکانی کەوا لەسەرت پێویستە ئەنجامی بدەیت.

٩- دان پێنان بە هەڵەکان پاش ڕوونبوونەوەی و زۆر داکۆکی نەکردن لەسەری هەڵە نیە. ئەمەش بەڕاستی بوێری و ئازایەتی و متمانەی دەوێ لە هەر یەکیان کە ئەو کارە بکات. وە پێویستە لایەنی دووەم سوپاسی ئەو هەڵویستەی بکات و بە گەورەی بگرێ (دان پێنان بە هەڵە خێرترە لە درێژەدان بە باتیل و ئەنگی)، وە دان پێنان بە هەڵە ڕێگەی ڕاست و دروستە و نابێت ببێتە هۆکارێك بۆ لایەنی دووەم کە فشار بخاتە سەر لایەنی یەکەم پاش دان پێنان بە هەڵەکەی، بەڵکو دەبێت ببێتە خاڵێکی گەشاوە لە پەیوەندیەکانی هەردوولاو بخرێتە ناو پەڕاو وتۆمارگەی چاکەکان و هەردەم باس بکرێت.

١٠- ئارام گرتن لەسەر هەندێك خوو وتەبیعات کەوا لە نەفس و فیترەتی ئافرەت ڕەگی داکوتاوە وەك (غیرە). عائشە دایکی ئیمانداران دەگێڕێتەوە کەوا (صفیە)ی دایکی ئیمانداران خواردنێك بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەنێرێ کە بەلاوە خۆش دەبێت و ئەویش دەفەرموێ ( ئەم دیوە کەس وەك صفیە خواردنی باش دروست بکات )، کاتێ عائشە گوێی لەو وتەیە دەبێت قاپەکە دەشکێنێ و خواردنەکە دەڕژێنێ. نسائی و ئەبو داود و ترمیزی گێڕاویانەتەوە. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کەوا هەندێك هەڵس وکەوت هەیە لەناو ناخی مرۆڤدا ڕەگی داکوتاوە و گۆڕینی ئەستەمەو کاتی زۆری دەوێت بۆیە پێویستە ئیعتباری بۆ دابنرێ و بە هەند وەربگیرێ.

١١- ڕازی بوون بە بەشی خواو قیسمەت و تەقدیری، گەر شتێکی خێری بینی ئەوا پێویستە شوکرانەی خوا بکات، ئەگەر شتێکی نا ڕێکی بینی ئەوا بیهێنێتە پێش چاوی خۆی کەوا هەموو کەسێك وەك ئەو وایەو خێزانی بەبێ کێشە نیە.

١٢- نا بێت کاتی تووڕەیی هەوڵ بدات ناکۆکیەکان چارەسەر بکات، بەڵکو واچاکە دوای بخات تاوەکو هێمن دەبێتەوەو دەمارگیریەکەی سارد دەبێتەوە، چونکە چارەسەر کاتی تووڕەی بڕیارەکان دوور دەخات لە ڕاستی.

١٣- تەنازول کردن لە هەندێك لە مافەکان پێویستە، چونکە دەست پێوەگرتنی هەر لایەك بە مافەکانی و بەرەوا زانینی هەرگیز ناگەن بەیەك وکێشەکە چارەسەر نابێت.

١٤- خۆڕاهێنان لەگەڵ هەموو بارو دۆخێکدا، وە هەردوو هاوسەر دەبێت لەسەرەخۆو ئارام بێت و پەلە نەکات لە بڕیارو هەڵەشەو تووڕەو دڵتەنگ و گرژ نەبێت هەموو کات.

١٥- پێویستە هەردوو هاوسەر بزانن کەوا ئاسوودەیی و خۆشی ناوخێزان لە بوونی سەرمایە و پارەی زۆر نیە، بەڵکو ئەو کارە بە تێگەیشتن لە ژیان ورێکەوتن و گونجاوی هەردوولا دێتە دی.

١٦- چاوپۆشین و لێبوردن لە هەڵەو لادان وناکۆکی بچوکی بێ مەبەست ، هەروەك وتراوە:

کەس هەیە بێ هەڵە وگوناه بێت؟ کەس هەیە تەنها چاکەکار بێت؟

لەسەر ئەم بابەتەوە بەرێز دکتۆر عمر بەتی پسپۆڕی پەروەردە ئەم خاڵانەی بەلاوە گرنگ بوو بۆ چارەسەری کێشەکان

ڕێگا چارەی بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان هاوسەرگیران:

- زوو چارەسەرکردنی هەرناکۆکی و شەرەدەنگێك و نەهێشتنی تەشەنەکردنی و ڕێگری لە گەورەبوونی .
- بایەخ وگرنگی دان بەیەکتری و دوورکەوتنەوە لە فەرامۆشکردنی یەکتری.
- داهاتی ماڵەوە (خێزان) هاوبەش بێت لە نێوان هەردوکیاندا دوور لەسەربەخۆیی واتە هەردوکیان بۆ یەکتر بژین.
- نەبردنە دەرەوەی نهێنی ماڵ بۆ کەسوکار و هاوڕێیان ئەگەرچی بۆ ئامۆژگاری و پەند وەرگرتنیش بێت.
- بەشداری پێ نەکردنی لایەنی سێیەم لەچارەسەرکردنی گیروگرفت و کێشەکانی خێزان.
- پەرەپێدان و زیاترکردنی خۆشەویستی بۆ یەکتر لە ڕێگای جۆراوجۆرەوە.
- بایەخدان بە بۆنە گرنگەکان.

- ڕێزگرتن لەیەکتر و بایەخدان بە تواناکانی یەکتری.
- دوور کەوتنەوە لە سەرزەنشتکردنی یەکتری و بەدیارخستنی کەموکوڕی یەکتر.
- زۆر نەکردن لە مێرد لەلایەن ژنەوە زیاد لە توانای ماددی خۆی.

هاوسەرگیری پێشوەخت وچ تەمەنێك گونجاوە بۆ هاوسەرگیری؟

- تەمەنی کوڕ و کچ گونجاو بێت
- تەمەنێك لەڕووی عەقڵی و ژیریەوە گونجاو بێت: هاوسەرگیری پرۆسەیەکی پڕ ئەرك و بەرپرسیاریەتیە، بۆیە کوڕان و کچان ئەگەر توانستە ژیرییەکانیان گونجاو نەبێت ، ئەمە کار دەکاتە سەر هەڵسوکەوتیان.
- پێویستە کوڕان و کچان توانا جەستەییەکانیان پێگەیشتوو بێت و گەشەی کردبێت بۆ ئەو کارە.
- پێویستە کوڕان و کچان توانا و لایەنی سۆزداری و هەڵچوونەکانیان پێگەیشتوو بێت و گەشەی کردبێت بۆ ئەو کارە. چونکە ئەم لایەنەش زۆر گرنگە لە پاڵ لایەنی ژیری و جەستەییدا.
- تەمەنێك توانای بڕیاردان و بەڕێوەبردنی هەبێت. بەتایبەتی هەندێك لە کوڕان و کچان فێری ئەوە بوونە زۆرتر پشت بە دایك و باوکیان ببەستن.
- تەمەنێك توانای هەبێت ڕووبەڕووی کێشەکان ببێتەوە. دەبێت کوڕان و کچان لایەنی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیان تەواو گەشەی کردبێت بۆ چوونە ناو ئەو پرۆسەیە.
- تەمەنێك توانای هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی هەبێت و لەڕووی ئابووریەوە هەردوولا بتوانن بچنە ناو ئەو پرۆسەیەوە و ژیانی خۆیان بنیات بنێن.

## باسی شەشەم: هەندێك لە سوودەكانی كێشەكانی نێوان هەردوو هاوسەر:

دكتۆرە پەیمان عزت باسی هەندێك لە سوودەكانی ئەم كێشانەمان بۆ دەكات.

١- خوێندنەوەو تێگەیشتن لە نەفسیەتی یەكتری ئاوێنەیەكە بۆ ڕەنگدانەوەی ئەو كارانەی كەوا لایەنی تر زویر و دڵتەنگی دەكات، وە ئەو شتانەی كەوا دڵی پێ خۆش دەبێت و ئاسوودەی دەكات، وە هەریەكیان شارەزای هەڵەی خۆی دەبێت لێی دوور دەكەوێتەوە، بەمەش دەتوانن ڕێڕەوی ژیانیان بەرەو باشتر ودروستتر ببەن.

٢- دەتوانرێ لە میانەی ئەو كێشانە هەریەكیان خاڵە بەهێزو خاڵە لاوازەكانی لایەنی تر دەست نیشان بكات، لایەنە چاك و خراپەكانیش دیاری بكرێت.

٣- هەروەك پارێزەرێك و قەڵغانێكن بۆ داهاتوو، چونكە هەریەكیان ڕاژەی زانیاری و شارەزایی بەرامبەر بە یەكتر زیاد دەكات.

٤- هەروەك قوتابخانەیەكە بۆ هاوسەرەكان كە تیایدا فێری سەبرو ئارامی و لێبووردن و دڵ فراوانی و چاوپۆشی و ڕق جوینەوەو دیالۆگی هێمنانەو زۆر شتی تر دەبن.

٥- گەر تەماشای مێژوو بكەین دەبینین زۆر لە زانایان لەبەر بوونی كێشە بیریان كردۆتەوە كەوا چارەسەری بۆ بدۆزنەوە، لەوانە تۆماس ئەدیسۆن گەر كێشەی تاریكی و شەوەزەنگ نەبوایە ئەوا هەرگیز بیری لەوە نەدەكردەوە كەوا كارەبا دروست بكات، وە هنری فۆرد گەر كێشەی هاتووچۆی نەبایە ئەوا بیری لە دروستكردنی ئۆتۆموبیل نەدەكردەوە، نمونەی زۆری تریش لەو جۆرە زۆرن، هەروەك دەڵێن (ئیعتیاج بوون سەرچاوەو دایكی داهێنانە).

٦- پست بەستن بە زات ، گەرانەوە بۆ (لای خود)، واتە كاتی سەرهەڵدانی كێشە پەنا بۆ خزم و كەس وكار مەبە ، بەڵكو خۆت بۆی دانیشەو هۆكاری بدۆزەوەو چارەسەری بۆ دیاری بكە.

٧- زانایان جەختیان یان لەسەر ئەوە كردووە كەوا كێشەی خێزان چارەسەرە بۆ كارەكانی ڕۆتینی ناو ماڵ ودووبارە بوونەوەی.

٨- هۆكارێكە بۆ كەمبوونەوەی پرتەو بۆڵەی ڕۆژانەو بەردەوام، هۆكارێكیشە بۆ ناسینی كەموكورتی ونەنگیەكان.

**٩- کەمکردنەوەی دەست تێوەردانی کەس وکارە لە کاروباری تاك وخێزان، پشت بەستانە بە خود.**

**١٠- بە خۆداچوونەوە بەرامبەر بە گوناهەکان چونکە زۆربەی کێشەکان دوورکەوتنەوەیە لە بەرنامەی خوا وپشتگوێ خستنی فەرمانەکانیەتی.**

﴿ ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُمْ بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ **الروم:** ٤١

**١١ – تاقیکردنەوەیەکە بۆ ئەوەی بزانن تا چ رادەیەك شوکرانە بێژن بە رامبەر بە نیعمەتەکانی خوای گەورە** ﴿قَالَ الَّذِي عِنْدَهُ عِلْمٌ مِنَ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ فَلَمَّا رَآهُ مُسْتَقِرًّا عِنْدَهُ قَالَ هَذَا مِنْ فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ وَمَنْ شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ ﴾ **النمل:** ٤٠

**١٢- زیاتر شارەزابوون لە بیروڕای یەکتری ونزیکبوونەوەی فیکری و دوور کەوتنەوە لە خاڵە لاوازەکان و دەست گرتن بە خاڵە بەسوودەکان.**

# بەشی سێیەم

## هاوسەرگیری لە ڕووی تەندروستیەوە



**باسی یەکەم:**

**دواکەوتنی منداڵبوون ( درەنگ منداڵبوون )**

**باسی دووەم:**

**منداڵ نەبوون بە گشتی.**

**باسی سێیەم:**

**نەبوونی ڕەگەزی نێرینە.**

**باسی چوارەم:**

**کێشەی جوانی و هەڵسوکەوت وڕەوشت**

**باسی پێنجەم:**

**دەرکەوتنی هەندێ نەخۆشی**

**دواى پرۆسەکە**

# پێشەکی ئەم بەشە

## ئەم بەشە لەلایەن د. ابراهیم طاهر مەعروف نوسراوە

چەندین جۆر کێشەی تەندروستی دێنە پێش ئەو دوو بەرێزەی کەوا هاوسەرگیریان کردووە لە هەردوو ڕەگەزی (نێرینەو مێینە).

سەرەتا هاوسەرگیری واتە: ئەو دوو کەسە هەردووکیان سەریان گیر کردووە و سەریان ناوە بەیەکدا و گرێبەستێکی توندیان بەستوە لە نێوان خۆیاندا بە شێوەیەکی بەردەوام (نەوەك کاتی) بە ئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی هەردوو خێزان، لەگەڵ بوونی ژمارەیەك لە مەرجی ماددی ومەعنەوی. واتە پێویست دەکات هەردووکیان هۆش و فکریان لە یەك نزیك بکەنەوە لێکی گرێ بدەن و لێك تێبگەن و نابێت بەئاسانی ئەم گرێبەستو پەیمانە بشکێنن لەسەر هەندێ کێشە کە ڕوو بەڕوویان دەبێتەوە، لەوانەیە زۆربەی زۆریشی لە تواناو دەسەڵاتی ئەواندا نەبێت، یان بە هۆکاری دەرەکی، یان دەست تێوەردانی خانەوادەو خزم و دۆستی نەزان بێت. بۆیە دەمەوێت پێش چوونە ناو بابەتەکە بەیادتتان بهێنمەوە کەوا پێش دڵشکانی یەکتری ومیان بڕیاردانی دوورکەوتنەوەو دابڕان زۆر بیر بکەنەوە سەدەها ڕێگەچارەی تر بگرنەبەر وشیکردنەوەی گشت بارەکان و لایەنە خراپ و چاکەکانی لەبەر چاو بگرن نەوەك دوایی پەشیمان ببنەوە، کە ئەو کات پەشیمانی داد نادات.

بە کورتی ئەو کێشە تەندروستیانەی ڕووبەڕووی هاوسەرەکان دەبێتەوە بریتیە لەمانەی خوارەوە، لەوانەیە زۆری تر هەبێت بەڵام لێرە ناتوانین باسیان بکەین، دەتوانن پەیوەندیمان پێوە بکەن گەر هەر دوو دڵی وتەم و مژیەك هەبوو لە بواری تەندروستیەوە.

## باسی یەکەم: دواکەوتنی منداڵبوون ( درەنگ منداڵبوون )

زۆر جاران هەردوو هاوسەرەکە خۆیان نایانەوێت منداڵیان ببێت، بەوەی کە ناتوانن بە خێوی بکەن لەبەر ئەوەی هەردووکیان فەرمانبەرن و، دەیانەوێت خەریکی منداڵ نەبن و ماڵ پێکەوە بنێن. بەڵام دەبینین دەوروبەرەکەیان، بەتایبەتی دایکی کوڕە دەست دەکات بە پرتەو بۆڵەو لێدانی توانج ودروستکردنی تۆمەت بۆ بووکی گوایە منداڵی نابێت یان منداڵی پێ بە خێو ناکرێت. ئەمەش فشاری دەروونی دەخاتە سەر ئافرەتەکە لەوانەیە ببێتە هۆی شێوانی کرداری بێ نوێژی(سووڕی مانگانە) و کار بکاتە سەر هۆرمۆنەکانی هێلکەدانیش و لە دوا ڕۆژدا کاریگەری خراپی هەبێت بۆ منداڵبوون.

بڕیاری دوا خستنی منداڵبوون بە چەند شێوەیەك دەکرێت وەك : قەدەغەکردنی سروشتی بە دیاریکردنی ڕۆژەکانی بێ نوێژی و ڕۆژەکانی پاکبوونەوە وڕێکخستنی کرداری بەیەکگەیشتنی نێوان هەردوو هاوسەر، دیاریکردنی ڕۆژەکانیش لەلایەن پزیشکی پسپۆڕی ئافرەتانەوە دەکرێت (هەر چەندە ئەو خشتەی ڕۆژانە دەگۆڕێت لە ئافرەتێکەوە بۆ یەکێکی تر بۆیە زۆر جار گۆڕپەلە دروست دەبێت). یان ئەو دواخستنە دەکرێت بە هۆی بەکارهێنانی حەب و دەرزی و دەزگای پزیشکی تایبەت کە ئێستا جۆریان زۆرە بە ناوی (وسائل منع الحمل). تکامانە لەو دوو هاوسەرە پێش ئەو بڕیارە ئەو بابەتە بۆ دایك و باوکی هەردوولاو ئەو کەسانەی تر کە زۆر لێیانەوە نزیکن ڕوون بکەنەوە تاوەکو کێشەیان بۆ دروست نەبێت.

## باسی دووەم: منداڵ نەبوون بە گشتی

زۆر جار هەیە ئەو دوو هاوسەرە منداڵیان نابێت، ئەمەش هۆکاری زۆری هەیە (لەوانەیە هۆکارەکە لە پیاوەکە بێت یان ئافرەتەکە) ئەمانەش لەوانەیە دەروونی بێت یان جەستەیی، یان پشێوی هۆرمۆنی بێت، یان هەندێ نەخۆشی زگماکی بێت، وەیان نەگونجانی کرۆمۆسۆمەکان بێت، یان هەندێك هۆکاری تری پزیشکی. ئەم بابەتە کێشەی زۆری لێدەکەوێتەوە زۆر جار دەگاتە جیابوونەوە. بۆیە بە پێویستمان زانی کەوا ئەم بابەتە بۆ هەردوو هاوسەرەکە ڕوون بکەینەوە تاوەکو کێشەیان بۆ دروست نەبێت.

١- لەوانەیە هەردووکیان هیچ کێشەیەکی تەندروستییان نەبێت، بەڵکو تەنها هۆکاری منداڵ نەبوون ئەوەیە کەوا کاتی بەیەك گەیشتنیان(جووت بوون) نادروستە بۆیە پێویستە سەردانی پزیشکی ئافرەتان بکەن بۆ ئەوەی کاتی گونجاویان بۆ بەیەك گەیشتن بۆ دیاری بکات، تاوەکو هەردوو توخمی زاوزێ ( ئاوی نێرینە- سپێرم و هێلکەی مێینە) بەیەك بگەن و پیتێن ڕووبدات و ببێتە کۆرپەلە.

٢- ئەگەر ئەم هۆکارە نەبوو، ئەوا پێویستە یەکەم جار پشکنین بۆ پیاوەکە بکرێت چونکە پشکنینەکە ئاسانەو هەرزانەو بە ماوەیەکی کەمیش دەردەچێت. ئەگەر پشکنینەکە نا دروست دەرچوو ئەوا لەلای پسپۆڕی تایبەت چارەسەر وەردەگرێ و لە زۆربەی جارانیش چارەسەرەکە سەرکەوتووە، بەڵام هەندێ جار ماوەیەکی دەوێت بەتایبەتی گەر چارەسەرەکە پەیوەندی بە هۆرمۆنەکان هەبوو. وە هەندێ جاریش پێویستی بە نەشتەرگەری دەکات بۆ ئەندامەکانی زاوزێ، کەواتە چارەسەرەکە پزیشکی تایبەت بڕیاری کۆتایی لێدەدات.

٣- گەر کێشەکە پەیوەندی هەبوو بە ئافرەتەکەوە پەلەکردنی ناوێت چونکە هۆکاری زۆری هەیە، پزیشکی پسپۆڕی ئافرەتان پشکنینەکانی بۆ دەکات و هەر کات گەیشت بە دیاریکردنی هۆیەکە ئەوا پزیشکی پسپۆڕی ئافرەتان لەگەڵ پسپۆڕی هەناو یان نەشتەرگەری چارەسەری گونجاوی بۆ دادەنێن بە گوێرەی جۆری هۆکارەکە. گەر زانرا کەوا بەیەك گەیشتن نیە لە نێوان هێلکەو سپێرمی پیاوەکە بە هەر هۆکارێك بێت، ئەوا بە ڕێگەی نەشتەرگەری چارەسەری بۆ دەکرێت، گەر هەر نەکرا ئەوا منداڵبوونی بلوری هەیە کەوا ڕێژەیەکی زۆرباشی سەرکەوتووە. زۆر جاریش بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ هەوڵدراوە کەوا ئەم دوو هاوسەرە منداڵیان ببێت نەتوانراوە،

**بەڵام نابێت ئەوە لە یاد بکەن زۆر جار چارەسەری پزیشکی دەستەوەستان دەوەستێت بەڵام دوایی گەر لای خوای گەورە نوسرا بێت ئەوا قەڵەمی لێدەدرێت و منداڵیان دەبێت و نموونەش زۆر هەیە لەو بابەتە. بۆیە داواکارین کەوا کەس بێ ئومید و هیوا بڕاو نەبێت و پێویستە ڕێگەی تەندروست و دروست بگرنە بەر و هەوڵی خۆیان بدەن و لە ڕووی دەرونیەوە خۆیان هاوسەنگ ڕاگرن و خەمی زۆرو بیرکردنەوەی بۆ نەکەن چونکە ئەمانە کێشەکە ئاڵۆزتر دەکات تاوەکو خوای گەورە دەرگای خێریان بۆ دەکاتەوە.**

**٤- ڕۆڵی دوعاو پاڕانەوە لە خوای گەورە کە ئەو بەخشەری گەورەو خاوەن فەزڵ و کەرەم و خەڵاتە. هەروەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز پێمان دەفەرمێ (خۆتان داوای لێخۆشبوون و پاڕانەوە لە خوای گەورە بکەن چونکە هەر ئەو بەخشەرو خاوەن خەڵاتە، هەر ئەو زاتەیە گەر بپاڕێنەوە بە ملکەچی بارانتان بۆ دەبارێنێت و ماڵ و سامان و منداڵتان پێدەبەخشێت، هەر ئەو زاتەشە کێڵگەو زەویتان بۆ ئاو دەدات و ڕووبارتان بۆ فەراهەم دێنێت). کەواتە دوعاو پاڕانەوەی دروست لە نێوان خۆتان وخوای گەورە ڕۆڵی سەرەکی هەیە لە بەخشینی منداڵ بە هەردوو ڕەگەزیەوە هەروەك فەرموویەتی:** ﴿ فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَلْ لَكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَلْ لَكُمْ أَنْهَارًا ﴿١٢﴾ سورة نوح.

## باسی سێیەم: نەبوونی ڕەگەزی نێرینە (نەبوونی کوڕ)

زۆرجاری واش هەیە ئافرەتە منداڵی دەبێت بەڵام هەموویان مێینەن، ئەمەش دەبێتە کێشە بۆیان لەبەر ئەوەی وا باوە لای خۆمان لەناو کۆمەڵگە ئەوەی کوڕی نەبێت ئەوا ناوی خانەوادەی نامێنێت و پێی دەڵێن (وجاغ کوێر)هەموو هەوڵ و کۆششی بە فیڕۆ دەڕوات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەوا مێینەکان هیچ ڕۆڵیان نیەو حیسابی هیچیان بۆ ناکرێ، بۆ وەڵامی ئەم کێشەیەش ئەم خاڵانە دەخەینە ڕوو.

بوونی منداڵی کوڕ یان کچ پەیوەندی بە ئافرەتەوە نیە بە هیچ شێوەیەك، بەڵکو پەیوەندی یەکەم بە قەدەری خوای گەورە هەیە گەر باوەڕمان پێیەتی، دووەمیان پەیوەندی بە جۆری سپێرمی (مەنی- ئاوی پیاو) هەیە. ئاوی پیاو دوو جۆر کرۆمۆسۆمی هەیە (XY) وە هێلکەی ئافرەت هەردوو کرۆمۆسۆمی یەك جۆرن (XX)، گەر جۆری سپێرمی پیاوەکەی دەچێتە ناو هێلکەی خیزانەکەی لە جۆری (Y) بوو ئەوا کۆرپەلەکە کوڕ دەبێت، بەڵام گەر جۆری سپێرمەکە (X) بوو ئەوا کۆرپەلەکە کچ دەبێت بە قەدەری خوا. هەندێ هۆکاری وردی تر هەیە کاریگەری هەیە لەسەر ڕەگەزی کۆرپەلە. کەواتە گەر کۆرپەکە کوڕ نەبوو ئافرەت تاوانی نیە لەو بارەیەوە. خوای گەورە دەفەرموێ: (موڵکی زەوی وئاسمانەکان بەدەست زاتی خوای گەورەوەیە و خۆی بەخشەرە، کچیان پێبدات یان کوڕیان پێبدات وەیان هەردووکیان پێبدات کچ و کوڕ، وە هەندێ جاریش نەزۆك دەبن ، هەر زاتی الله یە کە زاناو تواناداره بەم کارەوە).

﴿ لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ إِنَاثًا وَيَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ الذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا وَيَجْعَلُ مَنْ يَشَاءُ عَقِيمًا إِنَّهُ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴾ ﴿٥٠﴾ سورة الشورى

١- ئێمەی کۆمەڵگەی کوردەواری خۆمان بە موسڵمان دادەنێین بەڵام لە زۆربەی کارەکانمان ئاگاداری قەدەری خوا نین و تەسلیم بەو قەدەرە نابین وخێرو چاکەو شەڕو خراپە هەر بە تەرازوی دونیایی خۆمان دەپێوین، چونکە پێویستە بزانین کەوا هەندێ شت هەیە لەبەر چاوی ئێمە و بە زاهیری وادیارە خێرە بەڵام خۆی لە خۆیدا لە داهاتوو خراپەو شەڕە بەڵام ئێمە نایزانین، کەواتە گەر خوای گەورە ئەو شتەی پێنەداین مانای ئەوە نیە خێری بۆ ئێمە ناوێت، بەڵکو ئەو زاتە لە عیلمی غەیبی خۆی دەزانێ کەوا ئەو شتە شەڕو خراپەیە بۆت، بۆیە پێت نادات هەرچەندە لای ئێمە وادەزانین کەوا خێرو خۆشیە. زۆر کەسانێك هەبوون داوای زۆر شتیان لە

خوا کردووە و بۆی ئەنجامداون بەڵام لە داهاتوودا پێوەی بە هیلاك چوون یەکێك لەوانە منداڵی ڕەگەز (کوڕ)، زۆر کەسانێك هەبوون کاتی پیری تەنها لە ژێر سێبەری کچەکانیان حەساونەتەوەو هەر ئەوان خزمەتیان کردوون نەوەك کوڕەکان، چونکە کوڕەکان حەزیان کردووە زوو بمرێت یان فڕێ بدرێتە خانەی پەککەوتووان. وە بە پێچەوانەشەوە هەر بەهەمان شێوە زۆر جاریش کچ بووە بە بەڵا بۆ خانەوادەکەی. کەواتە بوونی کوڕو کچ هەر بەدەست خودایە و هەر ئەو زاتە بەخشەرەو بڕیاری سەرەتاو کۆتا هەر بە دەست ئەوە.

٢- منداڵ نەبوون : زۆر جاریش بووە ئەو دوو هاوسەرە منداڵیان هەر نەبووە هەرچەندە هەوڵی زۆریان داوە لە ڕووی پزیشکیەوە و پارەیەکی زۆریان خەرج کردووە بەڵام قەدەری خوای گەورە لەگەڵ ئەوەدا بووە کەوا منداڵیان نەبێت، یان بۆ ماوەیەکی دوور و پاش چەند ساڵێك ئینجا منداڵیان بووە، ئەوەش حیکمەتی خۆی تیایە بەڵام ئێمە نایزانین. بۆیە لەسەر ئێمە پێویستە ئەو شتانە بزانین بە وردی لێکۆڵینەوەی بۆ بکەین و تەسلیم بە قەدەری خوای گەورە ببین و بڕیاری هەڕەشەو جیابوونەوەو دڵ ڕەنجاندن نەدەین بە هیچ شێوەیەك.

﴿ لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ إِنَاثًا وَيَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ الذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا وَيَجْعَلُ مَنْ يَشَاءُ عَقِيمًا إِنَّهُ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ سورة الشورى

## باسی چوارەم: کێشەی تەمەن و جوانی و هەڵسوکەوت و ڕەوشت

لە ڕووی تەمەنەوە ئافرەت لە دوای ١٢-١٤ ی ساڵیدا دەچێتە قۆناغێکی تر ئەویش باڵغبوون و کەوتنە ناو کرداری سووڕی مانگانە واتە (بێ نویژی) یەوە. نێرینەش هەندێك درەنگتر بالغ دەبێت لەبەر هۆکاری هۆرمۆنی، نزیکەی ٢ ساڵ دواتر لە مێینە باڵغ دەبێت و دەگاتە تەمەنی پێگەیشتنی تەواو لە ڕووی جینسیەوە لە تەمەنی ١٤-١٦ ساڵیدا ئەمەش دەگۆڕێ لە وڵاتێك بۆ وڵاتیکی تر و لە نەتەوەیەك بۆ نەتەوەیەکی تر. بەڵام پێگەیشتن لە ڕووی هۆش و بیرکردنەوەو ئەهلیەتەوە پەیوەستە بە زۆر هۆکاری تر، واتە گەیشتنی پلەی (الرشد) تەنها پەیوەندی بە تەمەنەوە نیە. کوڕو کچ دەتوانن لە دوای ئەو تەمەنەوە هاوسەرگیری بکەن ئەگەر هیچ کێشەیەکی تری تەندروستیان نەبێت لە ڕووی ئۆرگانەکان و هۆرمۆنەکانەوە. وە دووری تەمەنی ئافرەت و پیاو (واتە یەکیان لە یەکیان گەورەتر بێت) کێشە دروست ناکات ئەگەر نێوانیان زۆر نەبێت و لە ڕووی ئاستی ڕۆشنبیری بیرکرنەوەش لێك نزیك بن.

سەبارەت بە جوانی: ئێمە هەموومان دروستکراوی خوای گەورەین و هەر ئەو زاتە بەرزە، شێوەو ئاکاری بۆ ئێمە داڕشتووە هێشتا هەر لە سکی دایکماندا بووین و خۆمان و دایك و باوکمان هیچ دەسەڵاتمان نەبووە لەم کارەدا چونکە پەیوەستە بە زاتی خوای گەورەوە، هەروەك فەرموویەتی:

﴿ يَا أَيُّهَا الْإِنْسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ ﴿٦﴾ الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِي أَيِّ صُورَةٍ مَا شَاءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾ سورة الانفطار

کەواتە پێویستە هەموو کەسیش بەو قەدەرە ڕازی بێت، چونکە گەر ڕازیش نەبوو هیچی پێناکرێت. دەبێ ئەوەش بزانین کەوا هەموو کەس جوانە و کەسی ناشرین نیە، هەروەك خوای خولقێنەرمان دەفەرموێ: (کەوا ئادەمیزادمان لە جوانترین شێوە دروستکردووە) ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾، خوای گەورە هەر یەکێك جوانیەکی تایبەتی پێداوە بەڵام ئێمە لەبەر هاتنە ناو ماددەو دوورکەوتنەوە لە ڕۆح ولایەنی مەعنەوی تەرازوومان شێواوەو لا سەنگ بووە و گشت پێوەرەکانمان تەنها ڕووکەشەو ناوەرۆکی نیە.

خاڵێکی تر کەوا جوانی ڕەوشت و هەڵسوکەوت و بیرو هۆش و ئەندێشەو تێگەیشتنە، ئایا چ لە جوانیەکی ئاکار دەکەیت گەر هەڵسوکەوتی جوان و ڕەوشت و تێگەیشتنی لەگەڵدا نەبێت؟ ئایا ئەو جوانیەی ئاکار هەروەك خۆی دەمێنێ گەر هەڵسا بەکردارێکی ناشرین، وەیان کردارێکی ئابڕوبەر؟ ئایا ئەو جوانیە دەمێنێت لەگەڵ چوونە ناو تەمەنەوە؟ ئایا وە ئایا و زۆر پرسیاری تر؟؟؟

خوای گەورە دەفەرموێ لە سورەتی (الكهف): (ئێوە شاهید نەبوون لەکاتی دروستکردنی زەوی و ئاسمان و خولقاندنتان...)

﴿ مَا أَشْهَدْتُهُمْ خَلْقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنْفُسِهِمْ وَمَا كُنْتُ مُتَّخِذَ الْمُضِلِّينَ عَضُدًا ﴿٥١﴾

کەواتە ئێمە کاتی دروست بوونمان پرسمان پێ نەکراوە، وە ئاگاداری دروستبوونی خۆمان نەبووین، تاوەکو نەخشەسازی بۆ خۆمان بکەین، هەروەها کاتی مردنیش نە پرسمان پێدەکرێت و نە ئاگاداریش دەکرێینەوە.

بەڵام دەتوانین ئەو جوانیەی خوای گەورە بە ئێمەی بەخشیوە جوانتری بکەین بە ڕەوشت بەرزی و هەڵسوکەوتی جوان و کردەوەی چاك و نواندنی ڕێزو خۆشەویستی بۆ هاوسەرو خانەوادەو گەورەو بچوك و کەس وکار و کۆمەڵگە بە گشتی، ئەو کات دەزانین کەوا کام جوانی زاڵە بەسەر ئەوەی تردا، ئەگەر خوای گەورە هەردوو جوانی ئاکارو ڕەوشتی پێبەخشیت ئەوا پێویستە زۆر زیاتر شوکری بکەیت، ﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾ سورة الضحى.

کەواتە ئەی لاوو کەنجی کوڕو کچ جوانی ئاکاری دەرەوە لە کاتی هاوسەرگیری و لە دوایشدا کار نەکاتە سەر بڕیارەکانتان، ئەگەر بە جوانیەك ڕازی نەبوویت خەڵکانی تر هەیە پێی ڕازیە، چونکە هەموو کەس وەك یەك بیر ناکاتەوە، و سروشت و بەرنامەی ژیانی هەموو کەس نابێت بەیەك چاو تەماشا بکرێت و نابێت ئەو شتانە ببێتە هۆکارێك بۆ دوورکەوتنەوەو جیابوونەوە لە ژیانی هاوسەرگیری.

## باسی پێنجەم:
## دەرکەوتنی هەندێ نەخۆشی کاتی پرۆسەکە، یان دوای پرۆسەکە

١- نەخۆشیەکانی زگماکی : ئەو نەخۆشیانەن کەوا لە کاتی ژیانی کۆرپەلەیدا دروست دەبن لە هەردوو ڕەگەز ، زۆربەیان لە تەمەنی منداڵی یان پێش تەمەنی پێگەیشتن نیشانەکانیان دیار دەکەون (واتە پێش گەیشتنە تەمەنی بالغ بوون)، ژمارەیەکی زۆر کەمیان نەبێت دەرناکەن دوای پێگەیشتن ، ئەوانیش لەگەڵ پێشکەوتنی زانستی پزیشکی زۆربەیان چارەسەریان هەیەو پێویست بە دڵتەنگی ناکات.

٢- نەخۆشیەکانی ڤایرۆسی: ئەمانەش کاتی دەست پێکردنی پرۆسەی هاوسەرگیری هەردوو ڕەگەز (کورو کچ) پشکنینی ئەو نەخۆشیانەیان بۆ دەکرێت، گەر پشکنینەکە پۆزەتیڤ بوو (واتە کەسەکە هەڵگری ڤایرۆسەکەبوو) ئەوا دەنێردرێتە بەڕێوەبەرایەتی پاراستنی تەندروستی بۆ لێکۆڵینەوە لە جۆری ڤایرۆسەکەو پلە و ئاستی نەخۆشیەکەو تێگەیاندنی هەردوو هاوسەرەکە لە نەخۆشیەکەو هۆکارەکانی گواستنەوەو چۆنیەتی خۆپاراستن و چارەسەر کردن گەر پێویست بوو، چونکە هەندێکیان پێویستیان بە چارەسەر نیە تەنها پێویستە بەدواداچوون بۆ نەخۆشەکە بکرێت و ژیانێکی ئاسایی بەسەر دەبەن.

٣- نەخۆشیەکانی تری وەك: هەوکردنی بەکتریاو بەردی زەرداو بەردی گورچیلەو پەستانی خوێن و شەکرەو زۆربەی نەخۆشیەکانی تر گیروگرفت نین، چونکە زۆربەیان چارەسەریان هەیەو ژیانیان بە شێوەیەکی ئاسایی بەڕێوەدەچێت ولە گشت کۆمەڵگەکانیش ئەو نەخۆشیانە هەن وبڵاوبوونەتەوە.



# بەشی چوارەم

## یاسای باری کەسی

## ژمارە ١٨٨

## ساڵی ١٩٥٩ هەموارکراو

بۆ ئەوەی ئەو خوشك و برایانەی پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجامدەدەن شارەزاییان هەبێت دەربارەی ئەو یاسایانەی کە لە کوردستان پەیڕەو دەکرێت و پەیوەستە بەم پرۆسەیە، داوامان کرد لە بەڕێز پارێزەر:علی احمد گردەسۆری تاوەکو لەسەر ئەم بابەتە بۆمان بنووسێ و بەڕێزیشی ئەم چەند لاپەڕەی بۆ ناردین.

بۆ شارەزابوون و ئاگاداربوون لە بڕگەو بابەتەکانی یاسای باری کەسی لە هەرێمی کوردستان ژمارە (١٨٨)ی ساڵی (١٩٥٩)ی هەموارکراو ئەوە لەسەر هەموو هاوسەرگیران پێویست دەکات زانیاریان دەربارەی یاساکە هەبێ، تاوەکو هەریەك لە ژن و مێرد مافەکانی خۆیان بزانن، خودا نەخواستە لەکاتی بوونی کێشە لەنێوانیاندا بزانن چۆن مافەکانی خۆیان بەدەست بهێنن وە لێرەدا بە کورتی ئاماژە بە هەندێك لەمادەو بڕگەی پێویست دەکەین کە لە یاساکەدا هاتووە.

هاوسەرگیری و خوازبێنی:

وەکو لەمادەی (٢) بڕگەی یەکەم خاڵی (١) دا هاتووە پێناسەی هاوسەرگیری دەکات:-

(هاوسەرگیری گرێ بەستێکی ئارەزوومەندانەیە لەنێوان ژن و پیاو، بە پێی شەرع بۆ یەکتری حەڵاڵ دەبن و مەبەست تێدا پێك هێنانی خێزانە لەسەر بنەمای خۆشەویستی و بەزەیی و بەرپرسیارەتی هاوبەش بەپێ حوکمەکانی ئەم یاسایە).

ئەرکەکانی گرێبەستی هاوسەرگیری و مەرجەکانی:-

مادەی چوارەم: هاوسەرگیری دادەمەزرێ بە نیشاندانی (ایجاب) لەلایەن یەکێك لە هاوسەرەکان و گوتنی (قبول) لایەنەکەی تر.

مادەی شەشەم:

١- مەرجەکانی دامەزراندنی هاوسەرگیری:-

أ- دەبێ (إیجاب) و (قبول) لەهەمان دانیشتن (مجلس) بێت.

ب- هەردوو هاوسەر گوێیان لەوتەی یەکتر بێ و تێبگەن کە مەبەستیان گرێبەستی هاوسەرگیریە.

ج- دەبێ قبول و گونجاو (موافق) بێ لەگەڵ (إیجاب).

د- دوو شاهێد کە کارامەیی یاساییان (أهلیة القانونیة) هەبێ لێرەدا پیاو وژن یەکسانن بۆ شاهێدی.

[١] - ئەو مەرجە شەرعیانەی دادەنرێ و کاتێ دەکرێتە مەرج لە گرێبەستی هاوسەرگیری ئەوە موعتەبەرەو دەبێ جێ بەجێ بکرێ.

[٢] - بۆ ژنەکە هەیە داوای هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەکە بکات کاتی بینی پیاوەکە ئەو مەرجانە جێبەجێ ناکات کە لەناو گرێبەستی هاوسەرگیری دا هاتووە.

[٣] - بۆ ژن هەیە مەرج لەسەر پیاوەکە دابنێت لە گرێبەستی هاوسەرگیری کە دەسەڵاتی پێدەدات کە خۆی تەڵاق بدات هەرکاتێ ویستی (تفویض بالتطلیق).

مادەی حەوت: الأهلیة (کارامەیی):- شیان

[١] - مەرجەکانی کارامەیی تەواو بۆ هاوسەرگیری بریتی یە لە (عەقل و تەواوکردنی هەژدەساڵی تەمەن).

[٢] - قازی بۆی هەیە مۆڵەت بدات بە یەکێك هاوسەرگیری بکات کە تووشی نەخۆشی دەرونی بووە (اهلیە)ی نەماوە ئەگەر بەراپۆرتی پزیشکی تایبەت چەسپا کە هاوسەرگیرییەکە زیانی نابێت بۆ کۆمەڵگا وە لەبەرژەوەندی کەسەکە دایە، وەبەرامبەرەکەی بەڕاشکاوانە ئەمە قبوڵ بکات کە هاوسەرەکەی (شیان) أهلیەی تەواو نیە لە گرێبەستەکەشدا بنوسرێ.

مادەی هەشت:

١- ئەوەی (١٦) ساڵی تەمەنی تەواو کردووە، بۆ قازی هەیە ڕێگای پێبدات کە سەلما کارامەیی و توانستی لاشەیی هەیە، دوای ڕازی بوونی (وەلی) شەرعی وە ئەگەر (وەلی) ڕازی نەبوو قازی داوای لێ دەکات ڕازی بێت لەو ماوەی بۆی دیاری دەکات، ئەگەر ڕازی نەبوون یان ناڕازی بوونەکی جێگای إعتبار نەبوو ئەوا قازی مۆڵەتی هاوسەرگیریەکە دەدات.

٢- بۆ قازی هەیە مۆڵەت بدات بە کەسێك کە (١٥) ساڵی تەمەنی تەواوکردبوو ئەگەر بینی پێویستی زۆر هەیە کە ئەم هاوسەرگیرە ئەنجام بدرێت (بۆ نمونە کاتێ کوڕو کچێك بڕیار دەدەن هاوسەرگیری بکەن لەدەرەوەی موافقەو ڕەزامەندی خێزان) و بە مەرجی بلوغی شەرعی و توانستی لاشەیی هەبێ.

٣- دایك بە وەلی دادەنرێ لەحاڵەتی باوك مردبێ یان ئامادە نەبێ وە دایکەکە بەخێوکەر بێت.

مادەی نۆیەم: هاوسەرگیری کردن بەزۆر (الاکراه):

١- بۆ هیچ خزم و کەسێك نیە زۆر لە کەسێك بکات نێر بێت یان مێ بۆ هاوسەرگیری بەبێ ڕەزامەندی خۆی، وە هاوسەرگیری بەزۆر بە پوچەڵ (باطل) دادەنرێ، ئەگەر نەگوازرابێتەوە وە ئەگەر گواسترابوەوە ئەوا گرێبەستەکە (موقوف) دەبێ لەسەر ڕای ئەوەی زۆری لێکراوە، جا کچەکە یان کوڕەکە بێت وەهەروەها بۆ هیچ خزم و کەسێك نیە کەسێك قەدەغە بکات لە هاوسەرگیری بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە.

٢- ئەوەی سەرپێچی لە حوکمەکانی مادەی (٩) بڕگەی (١) لەم مادەیە بکات حەپس دەکرێت بەمەرجێ لە دوو ساڵ کەمتر نەبێ و لە پێنج ساڵ زیاتر نەبێ ئەگەر خزمەکە لە پلەی یەك بوو، بەڵام ئەوەی سەرپێچی کارەکە لە پلە یەکەکان نەبوو ئەوە سزاکەی نابێ لە (٣) ساڵ کەمتر بێ و لە (١٠) ساڵ زیاتر.

**تۆمارکردنی گرێبەستی هاوسەرگیری و چەسپاندنی:**

**مادەی دەیەم: گرێبەستی هاوسەرگیری لە دادگای تایبەت ئەنجام دەدرێ و لە تۆماری تایبەت تۆمار دەکرێ، بەپێی مەرج و رێکارە یاساییەکان.**

**تێبینی: (ئەگەر ئەم هاوسەرگیریە لەدادگا تۆمار نەکرێ لەڕووی یاساییەوە ئەم هاوسەرگیریە بوونی نیە).**

**مافی ژن و حوکمەکانی: یەکەم: مارەیی**

**مادەی نۆزدەهەم: ژن هەموو ئەو مارەییەی دەکەوێت لە گرێبەستی هاوسەرگیری باسکراوە، ئەگەر باس نەکرابوو ئەوا حەقی مارەیی هاوشێوەی هەیە (مهر المثل). (مهر مثل) واتە سەرنج دەدرێ خوشکی یان دەستە خوشکەکانی لەسەر چەند مارە کراوە یان (عرف) چۆنی داناوە.**

**مادەی بیستەم:**

**١- جائزە مارەییەکە هەمووی یان بەشێکی پێشوەخت (معجل) بدرێ یان پاش وەخت (مؤجلا) بدرێ.**

**٢- دوا کات بۆ پێدانی مارەیی ئەویش بە مردنی پیاوەکە یان تەلاق دانی ژنەکەیە.**

**مادەی بیست وسێ : دووەم: بژێوی (النفقة)**

**بژێوی ژن لەسەر پیاوە وە لە حاڵەتێك ئەگەر ژنەکە حاڵی مادی باش بوو دەکرێ بەرپرسیارەتی دوولایەنە هەڵگرن ئەگەر ژنەکە ڕەزامەندی دا بەیەکەوە خەرجی ماڵ بکەن.**

**مادەی بیست و چوارەم:**

**١- بژێوی ئەو ژنەی کە پابەندبوونی خێزانی خۆی ئەنجام داوە بژێویەکە دەبێتە قەرز لە گەردنی مێردەکەی لەوکاتەی مێردەکە لاری دەکات لەدانانی بژێوی.**

**٢- بژێوی (بریتیە لە خواردن و پۆشین و کرێ چارەسەری تەندروستی و وە کرێ گرتنی خزمەتکار، ژن دەگرێ خزمەتی ژن بکات ، عرف ڕۆڵی هەیە لەم حاڵەتەدا).**

**هەڵوەشاندنەوەی گرێ بەستی هاوسەرگیری ( الطلاق )**

**مادەی سی و چوار:-**

**یەکەم: تەلاق هەڵگرتنی کۆتی هاوسەرگیریە بەراشکاوانە، وە لەڕووی شەرع و یاساوە، ئەم ماناو بەڵگەیە بدات کە مەبەستی تەلاقە بەبێ پابەندبوون بە صیغەیەکی دیاریکراو یان زمانێکی دیاریکراو.**

**سێیەم: دەبێ لەکاتی تەڵاق دان دوو شاهێد ئامادەبن ئەمانیش بێن لە پێش قازی ئەم شاهێدیە بدەن ، بە تەڵاق هەژمار ناکرێ ئەگەر دوو شاهێد لەکاتی تەڵاق دانی ئامادە نەبێت.**

**بڕگەو بابەتی زۆرە، وە لێرەدا (پیاو) ئەم تەڵاقەی بەدەستەو ژن دەتوانێ داوای هەموو مافەکانی خۆی بکات.. کە لە یاسای باری کەسی بەدرێژی باسکراوە.**

**لێکجیابوونەوەی قەزایی (التفریق القضائي)**

**مادەی چل: هەردوو لایەنی ژن و مێرد بۆیان هەیە داوای لێکجیابوونەوە بکەن ئەگەر هۆکارەکان تێدا هاتەدی:-**

**١- ئەگەر یەکێك لە ژن و مێردەکە زیانی بە ئەویتر گەیاند بە جۆریك کە نەتوانن ژیانی خێزانی بەیەکەوە بەردەوام بکەن وەکو ئالودە (الادمان) بوون لەسەر عەرەق و مادەی هۆشبەر، - دەبێ ئالودەبونەکە بەراپۆرتی پزیشکی تایبەت و فەرمی بچەسپی، هەروەها قومارکردن لەماڵەوە ئەوەی بە زەرەر هەژمار دەکرێ.**

**٢- ئەنجام دانی خیانەتی خێزانی جا هەر یەکیان بێت، هەروەها مومارەسەکردنی کاری نێربازی (لواط) بە خیانەتی زەوجی دادەندرێ.**

**٣- ئەگەر گرێبەستی هاوسەرگیری ئەنجام درابێ پێش ئەوەی یەکێك لە لایەنەکان هەژدە ساڵی تەمەنی تەواوکردبێ بەبێ مۆڵەتی قازی ئەنجام درابێ.**

**٤- ئەگەر هاوسەرگیریەکە لە دەرەوەی دادگا بوو بە زۆری ئەنجام درابوو گواسترابووەو (دخول) بوو.**

**٥- ئەگەر پیاوەکە ژنی دووەمی هێنا بۆ ژنی یەکەم هەیە داوای جیابوونەوە بکات لە دادگا.**

مادەی چل و یەك: هۆکارێکی تری جیابوونەوە ناکۆکی (خلاف)

هەردوولا بۆیان هەیە داوای جیابوونەوە بکەن ئەگەر نەگونجان (خلاف) ڕوویدا جا پێش گواستنەوە یان دوای گواستنەوە، بۆیە لە مادەی (٤١) خاڵی (٢، ٣، ٤) لە یاسای باری کەسی باسی کردووە لە ئەو حاڵەتانەی ژن بۆی هەیە داوای جیابوونەوە بکات.

مادەی چل و سێ:

یەکەم: لەم حاڵەتانەی خوارەوە ژن بۆی هەیە داوای جیابوونەوە بکات :-

١- ئەگەر مێردەکەی حوکم درا (بەندکرا) لە سێ ساڵ زیاتر بوو وە ساڵێك بەسەر بەندکردنەکە تێپەڕی با ژنەکە ماڵ و سامانیشی هەبێت بۆ خەرج و بژێوی خۆی و ماڵ و منداڵی.

٢- ئەگەر مێردەکە خێزانی خۆی بە جێهێشت بۆ ماوەی ساڵێك بەسەرەوە بەبێ هیچ عوزرێکی شەرعی ، وە ئەگەر شوێنی دانیشتنیشی دیاربوو، یا ژنەکە ماڵ و سامانیشی هەبێت بۆ خەرجی و بژێوی خۆی و منداڵەکانی.

٣- ئەگەر مێردەکە دوای مارەکردن ژنەکەی دوو ساڵ تێپەڕی نەیگواستەوە.

٤- ئەگەر ژنەکە بینی مێردەکەی پیاوەتی لەدەست داوە یان تووشی نەخۆشیەك بووە کە ئەرکی ژن و مێردایەتی پێ ناکرێ، جا هۆکارەکەی دەروونی بێت یان ئەندامی بێت ئەگەر دوای گواستنەوە تووشی ئەم حاڵەتە بوو، وە بەراپۆرتی پزیشکی تایبەتمەند سەلما کە توانای چاك بوونەوەی نیە ئەوە ژنەکە مافی ئەوەی هەیە داوای جیابوونەوە بکات، بەڵام ئەگەر دەرکەوت هۆکارەکە دەروونیە لەم حاڵەتە دادگا جیابوونەوەکە بۆ ساڵێك دوادەخا بەو مەرجەی ژنەکە لەم ماوەیە یارمەتی بدات لەکاتی سەرجێی .

٥- ئەگەر پیاوەکە نەزۆك بوو یان دوای گواستنەوەی تووشی نەزۆکی بوو، وە هیچ منداڵێکیان لە ژیان دا نەمابێ.

٦- دوای هاوسەرگیری دەرکەوت مێردەکەی تووشی نەخۆشیەك بوو، کە ناتواندرێ لەگەڵی دا بژی وەکو (گڕویی و سیل و زوهری و شێتی..)، ئەگەر دادگا بە ڕاپۆرتی پزیشکی بۆی دەرکەوت ئەم نەخۆشیە چاك دەبێتەوە، ئەوە جیابوونەوەکە دوادەخرێ تا کاتی چاك بوونەوە، وە ژنەکە بۆی هەیە لاری بکات لەسەر جێیی لەگەڵ مێردەکەی لەماوەی دواخستنی جیابوونەوەکە ئەگەر

دادگا بینی نەخۆشیەکە چاك نابێتەوە لەم ماوەیەو پیاوەکە لاری کرد لە تەلاق دانی خێزانی، وە ژنەکە سووربوو لە جیابوونەوە ئەوە دادگا بڕیار دەردەکات بە جیابوونەوە.

٧- مێرد لاری کرد لە دانی بژێوی بەبێ عوزری شەرعی و دوای ئەوەی مۆڵەتی شەست ڕۆژی پێدرا.

٨- ژنەکە نەیتوانی بژێوی لە مێردەکەی دەست بکەوێت بەهۆی دیارنەمانی یان بزربوونی یان بەندکرابێ زیاتر لە ساڵێك.

٩- ئەگەر مێرد لاری کرد لەسەر ئەو بژێویەی کە لەسەری کەڵەکە بوو دوای ئەوە شەست ڕۆژ مۆڵەتی دەدرێ لەلایەن فەرمانگەی جێبەجێکردن.

دووەم: بۆ ژن هەیە داوای جیابوونەوە بکات پێش گواستنەوە بەبێ هۆکار لەم حاڵەتەدا دادگا یەکسەر بڕیار دەدات بە جیابوونەوە، دوای ئەوەی ژنەکە هەرچی وەرگرتووە لەمێردەکەی لە مارەیی یان هەموو ئەو پارەو خەرجیانەی کە بۆ مەبەستی هاوسەرگیری خەرجی کردووە.

<u>مادەی چل و پێنج:</u> ئەو جیابوونەوە (التفريق) لە ڕێگای دادگاوە بێت بە تەلاقی بەینونەی بچوك (البينونة الصغرى) هەژمار دەکرێ.

<u>مادەی چل و شەشەم:</u> لێکجیابوونەوەی اختیاری (الخلع):

١- (خلع) لابردنی کۆت و بەندی هاوسەرگیری بە وشەی (خلع) واتە لە بەرامبەر پارەیەك یان شتێك (عوض) بەمەرجێ لەم مارەیی وەرگیراوەکەی زیاتر نەبێ، وە مەرج نیە پیاوەکە ڕازی بێت بەم (خلع)ە ئەگەر بۆ قازی ڕوون بوویەوە لەڕێگای ناوبژیوان کە ژنەکە ناتوانێ لەگەڵ پیاوەکە بژی.

٢- مەرجی ڕاستی (خلع) دەبێ پیاوەکە کارامەیی هەبێ بۆ تەلاق دانی ژنەکەی وە تەلاقی خلعی بە تەلاقی بائن دادەندرێ.

**مەرجەکانی هێنانی ژنی دووەم لە یاسا:-**

**أ- ڕازی بوونی ژنی یەکەم لە بەردەم دادگا.**

**ب- ژنی یەکەم تووشی نەخۆشیەکی درێژخایەن بووبێ و ببێتە هۆی قەدەغەکردنی لەسەرجێیی وە هیوای چاك بوونەوەی نەبێت، وە بەراپۆرتی پزیشکی تایبەتمەند سەلمابێ.**

**ج- ئەو پیاوەی داوای هێنانی ژنی دووەم دەکات دەبێ توانستی دارایی لە بەخێوکردنی زیاتر لە ژنێکی هەبێ، وە ئەمەش بەبەڵگەی فەرمی سەلمابێت و پێشکەشی دادگای بکات.**

**د- دەبێ پیاوەکە بەڵێننامەیەك پڕبکاتەوە لەبەردەم دادگا پێش ڕێکارەکانی گرێبەستی هاوسەرگیری کە دادپەروەری لەنێوان خێزانەکانی دەکات لەلایەنی (دارایی و مەعنەوی).**

**هـ- ئەگەر ژنەکە مەرجی لەسەر پیاوەکە دانەنابێ (نابێ ژنی بەسەر بێنێت) وە لە گرێ بەستی هاوسەرگیریەکەش نوسرابێ.**

**و- ئەگەر کەسێك ژنی دووەمی هێنا بەپێچەوانەی برگەکانی (أ، ب، ج، د، هـ) لەمادەی دووەم دا هاتبوو ئەوە سزا دەدرێت بە بەندکردن بەمەرجێك لە شەش مانگ کەمتر نەبێ و لە ساڵێك زیاتر نەبێ و پێژماردنی دە ملیۆن دینار.**

**ز- بۆ قازی نیە ئەو سزایانە ڕابگرێت کە لە برگەی ( و )ی سەرەوە هاتووە.**

# بەشی پێنجەم:

# ئامارەکانی عێراق و هەولێر

**باسی یەکەم:**

**ئامارەکانی عێراق بە گشتی و**

**چیرۆکی هەندێک لە هاوسەرەکان**

**باسی دووەم:**

**ئامارەکانی شاری هەولێر**

## باسی یەکەم: ئامارەکانی عێراق بە گشتی و چیرۆکی هەندێك لە هاوسەرەکان

هەندێك لە ئامارەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەوا ڕێژەی تەلاق و کێشەکانی هاوسەرگیری لە عێراقدا زۆر بەرز بۆتەوە کە گەیشتووەتە ڕێژەی ٦٥٪ بە ژمارەی ٨٢٠٤٥٣ تەلاق لەو چەند ساڵەی دوایی. ئەمەش بە هۆی چەند هۆکارێکی ئابووری و ڕامیاری و کۆمەڵایەتی بووە کەوا عێراق پیایدا تێپەڕیوە بە تایبەتی لەدوای ساڵی ٢٠٠٣. ئەم ڕێژە زۆرە بووەتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ژمارەیەکی زۆر لە خێزان و سەرگەردانی منداڵان و بڵاوبوونەوەی کاری نا دروستی سێکسی و زۆر شتی تری نادروست لەناو کۆمەڵگە.

لەو هۆکارانەی بوونەتە هۆی زۆربوونی ژمارەی تەڵاق، کردنەوەی دەرگای عێراق بەسەر وڵاتانی دەرەوەو بیانی و زۆربوونی ژمارەی کەناڵە ئاسمانیەکان و بڵاوکردنەوەی فلیمی سیکسی و پیشاندانی تەلاق وەك شتێکی زۆر ئاسایی ولەسەر شتی زۆر سادەو ناکۆکیەکی زۆر کەم، بەبێ گوێ دانە لایەنەکانی تری ئەم کارە نا دروستە. لە دادگاکانی الرصافە و ناوچەی (زەعفەرانیە) لە بغداد لەسەر وتەی پارێزەر حسام الفراوی ڕۆژانە ٢٠-٥٠ کەیس و حاڵەتی تەلاق هەیە. لە درێژەی وتەکانی دەڵێ: ناتوانم ئاماری دروست بدەم، بەڵام دەبینم ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبووندایەو لەهەر سێ پرۆسەی هاوسەرگیری یەکیان ئەنجامەکەی تەلاقە، ئەوانەی ئەم کارەش ئەنجام دەدەن تەمەنیان لە نێوان (٢٨-٣٨) ساڵیدایە. ئەو کێشە کۆمەڵایەتیە تەنها لە بەغدای پایتەختدا نیە، بەڵکو هەموو شارەکانی تری گرتۆتەوە، بۆ نموونە لە شاری میسان ڕۆژانە ٥٢-٧٥ حالەتی تەلاق هەیە، لە شاری ئەنبار (الرمادی) ڕۆژانە ٣٥-٤٢ حالەتی تەلاق هەیە، لە شاری کەربلا ش زیاتر لە ٤٥ حاڵەت هەیە ڕۆژانە.

هەروەها لە درێژەی باسەکەیدا دەڵێ: هەرکات کێشەی هاوسەرگیری گەیشتە دادگا مانای ئەوەیە تەلاق ڕوو دەدات چونکە لێکوڵەرەوە کۆمەڵایەتیەکان چاڵاك نین تاوەکو بتوانن نێوانی هەردوولا چاك بکەنەوە و پارێزەرەکانیش لە جیاتی هاندان بۆ چارەسەر ڕوو دەکەنە تەلاق بۆ بەرژەوەندی خۆیان.

پارێزەر غراوی ئەوەی گەڕاندەوە بۆ ئەو هۆکارانە: دادگا یەکێك لە پارێزەرە ئافرەتەکان دیاری دەکات بۆ بەرزکردنەوەی داوای سکاڵاکار، ئەو پارێزەرەش تەلاق بۆ ئافرەتەکە دەرازێنێتەوە

و باسی نەفەقەو لە باوەشگرتنی منداڵەکانی بۆ دەکات، بەرامبەر ئەوەش پارێزەرە پیاوەکەش کە پارێزەری پیاوەکەیە داوای ملکەچی ئافرەتەکەو گێڕانەوەی منداڵەکان بەرز دەکاتەوە بۆ پیاوەکە کە لە وانەیە بۆی ناکرێت جێبەجێی بکات، بەمەش ناکۆکیەکە گەورەتر دەبێت و کێشەکە ئاڵۆزتر دەبێت و تەنها سوود مەند پارێزەرەکان دەبن لەو نێوانەدا.

هەروەها لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: ئەوانەی داواکاریەکان دەنووسن حەرزوحاڵ نوسەکان (کاتبي العرائض) دەستیان لەم کارە ناڕەوایانە هەیە، چونکە هەندێك لە پارێزەرەکان پارەیان دەدەنێ تاوەکو ئەو پارێزەریان بۆ هەڵبژێرێ، تاوەکو ئەویش ببێ بە پاڵپشتی بۆ چارەسەری کێشەکەی بەڵام بەداخەوە دەبنە مشەخۆر لەسەریان و کۆتاییەکەی دەکەنە تەلاق و جیابوونەوەیە.

هەروەها دەڵێ : زیاتر لە ٩١٪ ی گەورەبوونی کێشەکان هۆکاری تەماع و بێ ویژدانی نووسەری داواکاریەکان و پارێزەرەکانن چونکە ناکۆکی نێوان هاوسەرەکان بۆتە سەرچاوەیەکی سەرەکی سەرمایە کۆکردنەوە بۆیان، بە تایبەتی ئافرەتەکان چونکە ئافرەتەکە فێردەکەن کەوا زیاتر لەیەك سکاڵا بەرزبکاتەوە دژی پیاوەکەی بەمەش کێشەکە گەورەتر دەکات و مەبەستیشی ئەوەیە زیاتر پارە وەربگرێ چونکە ژمارەی داواکاریەکان زیاتر بوونە. دەرکەوتووە کەوا خەرجی کێشەی یەك ناکۆکی نێوان هاوسەرەکان دەگاتە زیاتر لە ملیۆن دیناری عێراقی و بەزیادبوونی داواکاریەکان پارەکەش زیاد دەکات بەناوی ماندووبوونی پارێزەر.

هەروەها لە درێژەی باسەکەیدا دەڵێ: بۆ پارێزەرەکان وا باشترە کێشەکەیان بۆ چارەسەر بکات بەبێ پەنا بردنە بەر دادگا چونکە بانگکردنی پیاوەکە بۆ دادگا و دەست تێوەردانی پارێزەر وا دەکات کێشەکە گەورەتر ببێت، چونکە کەس وکاری پیاوەکە زۆربەی جار ڕازی نابن ئافرەتەکە بگەڕێننەوە بۆ ماڵی کوڕەکەیان چونکە ئەو ئافرەتە ئەوەندە هاوسەرەکەی لا بێ نرخ بووە و سکاڵای لە دادگا لەسەرتۆمار کردووەو و ڕایکێشاوە بۆ دادگا بەبێ ئەوەی پرسێك بەوان بکات بۆ چارەسەر.

پارێزەر طارق الحرب: هۆکاری ئەو ڕێژە بەرزەی تەڵاقی گەڕانەوە بۆ ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، چونکە زۆربەی ئەو ڕێکخراوانە سەر بە وولاتی ئەمەریکان و وایان لە لێپرسراوی ڕێکخراوەکانی ئافرەتان کردووە کەوا ئافرەتان بهێننە سەر نەمەت و ژیانی ئافرەتانی

ئەمەریکا، وایان بۆ شیکردوونەتەوە کەوا هەر ووشەیەك پیاو بیکات بەرامبەر خێزانەکەی ئەوا ئیهانەو سووکایەتیەو دەبێت قبول نەکرێت و بەندەکانی ڕێکەوتننامەی سیداویان بۆ باسکردوون کەوا زۆربەیان لەسەر کۆمەڵگەی ئێمە جێبەجێ نا بێت.

هەروەها دەڵێ: بۆچی ئەو ڕێکخراوانە ناچن بەدەم کێشەکان و چارەسەریان بۆ بکەن لە جیاتی ئەوەی تەبل ودۆڵی بیروبۆچوونی ئەمەریکیەکان لەناو کۆمەڵگە دووبارە بکەنەوەو بۆیان برازێننەوە.

نموونەی هەندێك لە کێشەی هاوسەرەکان:

١- کچێك بەناوی عەبیر دەڵێت: لەماڵەوە بە زۆر منیان دا بە کوڕی خاڵم، بەڵام خۆم پەیوەندی خۆشەویستیم هەبوو لەگەڵ قوتابیەکی کۆلیژی خۆم، دوای هاوسەرگیری نەم توانی لەگەڵی بژیم و داوای تەڵاقم کردوو تەنازولم کرد لە هەموو مافەکانم بەو خەیاڵەی کەوا دۆستەکەم خوازبێنیم دەکات، بەڵام دوای تەڵاق خۆی لێ نەناس کردم و بۆم دەرکەوت کەوا نایەوێت ئافرەتێکی بێوەژن بهێنێ هەرچەندە خۆشی دەویست.

٢- باوکی محمد کە شوفێری تاکسیە دەڵێ: پاش هەڵبژاردنی هاوسەرەکەم و بوونی چوار منداڵ لە نێوانماندا، هاوسەرەکەم وەفاتی کرد، زۆر ئافرەتیان بۆ دۆزیمەوە کە خوازبێنی بکەم بەڵام کەسیان بە دڵم نەبوو، دوایی ئافرەتێکیان بۆ دۆزیمەوە لە خانەقین گوایە زۆرباشە و منداڵەکانم بە خێو دەکات، بەڵام دەرکەوت کەوا تەبیعاتی زۆر توندەو دڵ ڕەق و بێ بەزەییە بەرامبەر منداڵەکان، تاوای لێهات ژووری خۆم جیاکردەوە لەبەر دەنگ و هەرای ڕۆژانەی و لە کۆتاییدا گەیشتمە تەڵاق چونکە هیچ زمانی گفتوگۆو حالی بوونی نەبوو.

٣- (صلاح) کە ئەفسەری پۆلیسە وتی: کوڕەکەم بۆی گێڕامەوە کەوا دایکی لەگەڵ پیاوێکی بێگانە بە مۆبایل زۆر قسەدەکات بۆیە منیش لێمداو وتم ئێستا لەگەڵ ئەو پیاوە قسە بکەو بزانم چی دەوێت بەڵام سەرپێچی کردو منیش لێمداوە دووبارە، کاتی ڕۆیشتنم بۆ دەوام دایکم تەلەفۆنی بۆ کردم کەوا منداڵەکانی بردووەو هەڵاتووە بۆ شارێکی تروو هەشت مانگ منی بێبەشکرد لە بینینی منداڵەکان. پاشان پیاوی باش وخەڵکان کەوتنە نێوانمان و منداڵەکانم دیتن، ئەوانیش باسی ئەوەیان بۆ کردم کەوا دایکیان و براو خوشکەکانی زۆر بەتوندی مامەڵە لەگەڵ منداڵەکان دەکەن و لێدانی باشیان بۆ دەکەن و لەبەر تیشکی خۆر دەیانبەستنەوە وەك ئاژەل وبرسییان

دەکەن، هەرچەندە مانگانە نەفەقەی (٤٠٠٠٠٠) دیناری عێراقی وەردەگرێت لە مێردەکەی، پاشان سکاڵام کرد بۆ دادگا بۆ گێڕانەوەی منداڵەکانم بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆم، زۆریان ماندوو کردم و لەخۆم بێزار بووم، بەڵام جیرۆکەکەی بۆ تەواو نەکراو ...وەڵامی نەداوە .

٤- (ڕەجا) ئافرەتێکەو خاوەنی چوار منداڵە، بەڵام هاوسەرەکەی ماڵی خۆی بۆ نەکردووە هەرچەندە تەنازولی کردووە لە هەموو مافەکانی و زێڕی خۆی و ژووری نوستنی بۆ فرۆشتووە، لەگەڵ ئەوەشدا لە ماڵی باوکی دەژیت، پارەی لێدەسەنێ ومنداڵەکانی برسی دەکات و لە ژێر سێبەری خانەوادە دڵ ڕەقەکەیاندا ژیانیان بەسەر دەبەن، هەرکات داوای لێدەکات کەوا پێویستە هەستی لێپرسینەوەی هەبێت دەست دەکات بە لێدانی و دەرکردنی لەماڵەکەی، بۆیە داوای تەڵاق دەکەم تاوەکو لە دەست لێدان و برسیەتی ڕزگارم بێت.

ژمارەکان دەدوێن: بریکاری سیستانی لە بواری شەرعی و هاوسەرگیری لە مەدینەی شەعب (مدینە الشعب) لە بەغدا دەڵێ : پێش ساڵی ٢٠٠٣ ڕێژەی تەڵاق ٣٪ بوو، لە ساڵی ٢٠٠٥ گەیشتە ٢٩٪ و لەساڵی ٢٠٠٧ گەیشتە ٥٠٪ ، لە ساڵی ٢٠٠٩ گەیشتە ٦٥٪.

بە پێی ئەو بەیانەی دەرچووە لە کۆمیسیۆنی باڵای قەزا، ژمارەی داواکانی تەڵاق گەیشتە ٢٨٦٨٩، لە ساڵی ٢٠٠٥ گەیشتە ٣٣٣٤٨، پاشان بەرزتر بۆوە لە ساڵی ٢٠٠٦ گەیشتە ٣٥٦٢٧، لە ساڵی ٢٠٠٧ گەیشتە ٤١٥٣٦. وە لە ساڵی ٢٠٠٩ گەیشتە ٨٢٠٤٥٣ تەڵاق بە کۆی گشتی.

لە کۆتاییدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کەوا کۆمەڵگەی عێراقی پێویستی بەوە هەیە کەوا زۆر بە جدی بەرامبەر ئەو کێشەیە بوەستێ و لایەنەکانی شی بکاتەوە تاوەکو بتوانێ خێزانی عێراقی ڕاست بکاتەوەو زیاتر منداڵەکانیان سەرگەردان نەبن و ئالودەی جگەرەو مەی و ماددە بێهۆشکەرەکان و تاوان نەبن. نەبوونی کارو کاسبی و دانەمەزراندن ئەویش هۆکارێکە بۆ زیادبوونی تەڵاق چونکە پێداویستیەکانی خێزانداری زۆرەو باری ئابووری زۆربەی خەڵکیش خراپە بۆیە گەنجەکان لە هەردوو ڕەگەز توانای کۆنترۆڵ کردنی خۆیان نیەو پەنا دەبەنە بەر تەڵاق بۆ دەربازبوون لە خێزانداری وکێشەو پێداویستیەکانی .

پێویستە زیاتر گرنگی بدەین بە کردنەوەی خولی تێگەیاندن و پێگەیاندن بۆ گەنجەکانمان لە هەردوو رەگەز دەربارەی پیرۆزی خێزان و چۆنیەتی مامەڵەکردنی هەردوولا لەگەڵ یەکتری و چۆنیەتی پەروەردەی منداڵ تاوەکو ببنە تاکێکی چالاك وسوودمەند لە کۆمەڵگە.

## باسی دووەم: ئامارەکانی شاری هەولێر

**لە سەرۆکایەتی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر/ بەشی پلان و ئامار**

لە دەزگای بەیان بۆ گەشەپێدانی مرۆیی نوسراوێکی فەرمیمان بەرزکردەوە بۆ بەرێز سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر بەرێز (حاکم شاکر) لە بەرواری ٢٠١٤/١١/٢٠ ، تیایدا داوامان کردبوو کەوا ئاماری ژمارەی ئەوانەی پرۆسەی هاوسەرگیریان ئەنجامداوە لە شاری هەولێر و ژمارەی ئەو کێشانەی کەوا هاتووەتە دادگاو لێکۆڵینەوەی بۆ کراوەو ئەنجامەکەی گەیشتووەتە تەلاق و جیابوونەوە لە ڕێگەی دادگا. ئەو داواکاریەش بۆ ئاماری هەردوو ساڵی (٢٠١٣-٢٠١٤) بوو، بەرێزیان ڕەزامەندی داو، فەرمانی دەرکرد کەوا بەشی ئامار هاوکاریمان بکات، ئەوانیش زۆر بەرێزەوە کارەکەیان بۆ ئەنجامدایـن، سوپاسیان دەکەین و دەستخۆشیان لێدەکەین بەتایبەتی خوشکە(ئەسرین موستەفا سلیمان) بەڕێوەبەری ئامار، وە هەروەها پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کەوا خوشکە (هەرسین ابراهیم محمد-) (لێکۆڵەرەوەی دادگایی- محقق قضائي) یش هاوکاری زۆری کردین بۆ وەرگرتنی مەوعدو ئاسانکردنی کارەکان.

لە ساڵی ٢٠١٣: ژمارەی پرۆسەی هاوسەرگیری (١٨٣٥٤) بەرامبەر ٢٧٦٠ تەڵاق، واتە بە ڕێژەی ١٥٪.

| بابەت | ژمارە | ڕێژەکەی ٪ |
|---|---|---|
| نەگونجان لەگەڵ یەکتری | ٧٤٧ | ٢٧.١ |
| جیاوازی تەمەن | ١٣٢ | ٤.٧ |
| هۆکاری نەزۆکی | ٥١ | ١.٨ |
| داوێن پیسی (الخيانه الزوجيه) | ٢٤٨ | ٩٪ |
| نەبوونی ماڵی جیا | ١٧٦ | ٦.٣٧ |

| | | |
|---|---|---|
| ژن هێنانی دووەم | ٧٥ | ٢.٧ |
| تەکنۆلۆجی سەردەم(مۆبایل، انترنیت) | ١٤٤ | ٥.٢ |
| توشبوونی یەکێکیان بە نەخۆشی | ١٢ | ٠.٤ |
| هۆکاری کۆمەڵایەتی | ٤٠١ | ١٤.٥ |
| هۆکاری ئابووری | ٣٦٥ | ١٣.٢ |
| هۆکاری ئاینی | - | - |
| هۆکارەکانی تر | ٤٠٨ | ١٤.٨ |
| نەبوونی توانای جنسی | ١ | ٠.٠٣ |
| کۆی گشتی | ٢٧٦٠ | |

هۆکاری جیابوونەوەش ڕێژەکەی بەم شێوەی خوارەوەیە:

لە ساڵی ٢٠١٤ ، ئاماری تەنها ٩ مانگ: کۆی پرۆسەی هاوسەرگیری (١٥٥٥٠) ژمارە تەڵاق (١٧٠٩)، واتە ڕێژەی ١١٪ .

| بابەت | ژمارە | ڕێژەکەی ٪ |
|---|---|---|
| نەگونجان لەگەڵ یەکتری | ٥٤٩ | ٣.٥ |
| جیاوازی تەمەن | ٥٠ | ٠.٣٢ |
| هۆکاری نەزۆکی | ٢٣ | ٠.١٤ |
| داوێن پیسی (الخيانة الزوجية) | ١٩٩ | ١.٢٧ |
| نەبوونی ماڵی جیا | ١٨٣ | ١.١٧ |
| ژن هێنانی دووەم | ٥٢ | ٠.٣٣ |
| تەکنۆلۆجی سەردەم(مۆبایل، انترنیت) | ١١٩ | ٠.٧٦ |
| توشبوونی یەکێکیان بە نەخۆشی | ٣ | ٠.٠١ |
| هۆکاری کۆمەڵایەتی | ٢٥٠ | ١.٦ |
| هۆکاری ئابووری | ١٨٨ | ١.٢ |
| هۆکاری ئاینی | ١ | |
| هۆکارەکانی تر | ٩٢ | ٠.٦ |
| نەبوونی توانای جنسی | | |
| کۆی گشتی | ١٧٠٩ | |

ئەگەر سەیرێکی ووردی ئەو ژمارەو ڕێژانە بکەین دەبینین کەوا ڕێژەی نەگونجان لەگەڵ یەکتری ڕێژەکەی لە هەموان بەرزترە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك:

١- باش یەکتر نەناسینی یەکتری پێش چوونە پێش بۆ خوازبێنیٚ ئەوەش زۆری دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خۆشەویستیەی کەوا ئێستا لەناو گەنجەکان باوە، کە خۆشەویستیەکی کاتیەو پەیوەندی بەرژەوەندیەوە هەیە نەوەك خۆشەویستی ڕاستەقینە کەوا لە پێناو یەکتری وبەرژەوەندی خێزان هەموو شتێك دەکاتە قوربانی هەرچەندە ئەگەر گیانی خۆشی بێت.

٢- کەمی ڕۆشنبیری جا ئەو ڕۆشنبیریە لە بواری زانستی بێت یان کۆمەڵایەتی یان پەیوەندی خانەوادەیی بێت. ڕۆشنبیری تەواو زۆر پەیوەست نیە بە پلەو جۆری بڕنامە، چونکە زۆر کەسان هەن پلەی زانستیان بەرزە بەڵام لە ڕووی کۆمەڵایەتی وخزمایەتی و پەیوەندی تاك و خێزانداریدا ئاستی زۆر نزمە یان هەر سفرە بۆیە پێویستە گەنجەکانمان بارگاوی بکەین بە ڕۆشنبیری گشتگیری بەتایبەتی کۆمەڵایەتی پێش چوونە ناو پرۆسەی هاوسەرگیری.

٣- نەگونجان بە هۆی جیاوازی لە هاوتایی و گونجاویەتی (التکافؤ)جا ئەو هاوتاییە کۆمەڵایەتی بێت یان ڕۆشنبیری یان دارایی و ئابووری یان عەشایری بێت.

٤- نەگونجان بەهۆی دووری شوێنی ژیان یان دووری کەلتوری نەتەوایەتی و زمان و خاك وولات بێت.

هۆکاری کۆمەڵایەتی ئەویش ڕێژەکەی بەرزە کە ئەویش هۆی تایبەتی زۆری هەیە و زانایان و کۆمەڵناسان لە بەشداربووانی ئەم پەرتووکە زۆر باسیان لە هۆکارەکانی کردووە، بۆیە پێویست ناکات دووبارەی بکەینەوە.

هۆکارەکانی بەد ڕەوشتی: ئەویش هۆی زۆری هەیە کە هەندێکیان بەکورتی باس دەکەین:

١- کرانەوەی سنوورەکانی کوردستان و عێراق لەسەر ولآتانی دراوسیٚ و کرانەوەشی بەسەر جیهان و هاتنی ژمارەیەکی زۆری کرێکارو کاسبکارو بازرگان بۆ ناو کوردستان.

٢- کۆچ کردنی لاوان بۆ هەندەران و مانەوەیان بۆ ماوەیەکی دووروردرێژو تێوەگلانیان بە کردەی سێکسی نا شرعی.

٣- هاتنی شاندە بیانیەکان و کۆمپانیاکان.

٤- شەڕی ناوخۆی عێراق و ئاوارەبوونی هاووڵاتیان وهاتنیان بۆ هەرێمی کوردستان لە شارە جیاجیاکانی عێراق.

٥- زۆربوونی شوێنە گەشتیارییەکان و زۆر بوونی گەشتیاران.

٦- مەترسی بلاّوبوونەوەی مادە بێهۆشکەرەکان و بەکارهێنانیان لەلایەن گەنجەکان.

٧- زۆربوونی میدیاکان و بلاّوبوونەوەی فلیمی سیکسی و توندوتیژی و چاولێکردنەوەیان لەلایەن خەڵکانی هەرزەکارو نا ڕۆشنبیر.

٨- هێرشی فەرهەنگی و ڕۆشنبیری بیانی بۆ سەر خەڵکی ناوچەکەو بلاّوکردنەوەی ئەو بیروباوەڕانەی کە لەگەڵ کۆمەڵگەکەمان ناگونجێ.

٩- ئینترنیت و فیس بووك و پێگەکانی تری تۆڕی کۆمەلاّیەتی.

١٠- دوور کەوتنەوە لە ئاین و ڕەوشتی ئیسلامی و دابونەریتی ڕەسەنی کوردەواری.

دکتۆرە پەیمان عزت اسعد کە توێژەرێکی کۆمەلاّیەتیەو باوەڕنامەی دکتۆراکەشی لەسەر کێشەکانی خێزانە لە ماوەی ساڵانی ٢٠١٣ و٢٠١٤ نزیکەی ٤٧٥ کێشەی خێزانی هاتووەتەلا وتوانیویەتی نزیکەی ٨٤٪ ی کیشەکان چارەسەر بکات بەتەنها، بەبێ چونە دادگا. دکتۆرە پەیمان لیستێکی بۆ کردوون بە هۆکاری کێشەکان ژمارەیان و ڕێژەکانیان.

ژمارەی گشتی کێشەکان ٤٧٥

| جۆری هۆکار | ژمارە | ڕێژەکان |
|---|---|---|
| خیانەتی یەکێك لە هاوسەرەکان | ١٥٧ | ٣٣ |
| نەگونجانی کۆمەڵایەتی | ٨٠ | ١٦.٨ |
| زوو بە شوودان | ٧٢ | ١٥.١٥ |
| کێشەی پەروەردەی منداڵ وچۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیان | ٥٥ | ١١.٦ |
| نەبوونی گفتوگۆ ودیالۆگ لە نێوانیان | ٤٨ | ١٠.١ |
| دەست تێوەردانی خزم وکەس وکار | ٣٥ | ٧.٣٦ |
| توندوتیژی لە نێوانیان | ٢٨ | ٥.٩ |

هۆکارە سەرەکیەکانی خیانەتی هاوسەرێتی

١- کارکردنی ئافرەت لە دەرەوەی ماڵ.

٢- سەفەری ئافرەت بە تەنها و بەبێ مەحرەم.

٣- گومانی زۆرو تاوانبارکردنی یەکتری بە ناڕەوا.

٤- پستگوێ خستنی پیاو بۆ ئافرەتەکەی.

٥- هاوسەرگیری پەنهانی وەك زەواجی موتعەو مسیار.

٦- کەم تێگەیشتن لە ئاین و پەیامەکەی.

٧- مانەوەی پیاو بە تەنها بەرامبەر فلیمە سێکسیەکان و ئینتەرنێت.

٨- پەیوەندی کردن بە ئینتەرنێت لەگەڵ کەسی بێگانە.

٩- سەرقاڵی بوون بە ژیانی ماددی دونیاو لە بیرکردن و پشتگوێ خستنی هاوسەرو ماڵ و منداڵ.

## سەرچاوەکان

١- محمد عبدالهادي، العلاقات الإجتماعية بعد الزواج

٢- سلمان الشمراني، انواع الشخصية وتاثيرها على العلاقات الأسرية

٣- سۆسیۆلۆژیای خێزان، مليحة عونى القصير ود. صبيح عبدالمنعم احمد و: صابر بكر بوكانى

٤- د.معن خليل، کۆمەڵناسی خێزان، و: ئارام امين جلال

٥- سهير احمد سعيد معوض، حقيبة تدريبية اكادمية، علم الاجتماع الاسري

٦- علم الاجتماع، ص ٤٨٧

٧- اثر الأسرة والمجتمع في الأحداث الذين هم دون الثالثة عشر: ص ٣٧

٨- مجلة المختار ، عدد ابريل لسنة ١٩٥٦ تحت عنوان أقوال مأثورة.

٩- مجلة الهلال عدد مايو لسنة ١٩٥٧: ص ١٨

١٠- هەندێك سەرچاوەی دیکە لەئینتەرنێت.


ناوەرۆك



دەزگای بەیان بۆ گەشەپێدانی مرۆیی

مؤسسة البيان للتنمية البشرية

AL-BAYAN FOUNDATION FOR HUMAN DEVELOPMENT

ئەم پەڕاوە لەسەر ئەرکی (دەزگای بیان بۆ گەشە پێدانی مرۆیی) چاپکراوەو بە خۆڕایی دابەش دەکرێت بەسەر ئەو خوشك و برایانەی کە پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجام دەدەن.

لەم پەڕاوەدا ئەم بابەتانە بخوێنەوە:

١- بنەماو ئامانجەکانی هاوسەرگیری

٢- گرنگی هاوسەرگیری لە ژیانی مرۆڤدا

٣- کێشە کۆمەڵایەتی وئابوری و تەندروستیەکان و چارەسەری

٤- یاساکانی هەرێمی کوردستان پەیوەست بە هاوسەرگیری

٥- ئامارەکانی عێراق و شاری هەولێر پەیوەست بەم پرۆسەیەوە













چاپخانەی حاجی هاشم / هەولێر
0750 447 6899

